## پێناسی کتێب:

ناوی کتێب: **کلیلی هاوڕێیەتی**

نووسین: باخان وشیار

پێداچونەوە: مامۆستا مەریوان ئەحمەد

بابەت: گەشەپێدانی مرۆیی

دیزاینی بەرگ: ANQ

دیزاینی ناوەڕۆک: ANQ

ژ. لاپەڕە: ٠٠٠

چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ز

---

چاپی: چاپەمەنی ئەستێرە



## پێشەکی :

سوپاس و ستایش بۆ خودای دلۆڤان و درووود و سڵاو لە خانەدانترین ئادەمیزادی سەر زەوی پێغەمبەرمان درووودی خودای لەسەربێت. ئەم کتێبە هەندێك لە ڕازەکانمە کە بۆ بەهێزکردنی نێوان و ڕوحییەتی هەر جۆرە هاوڕێیەتییەك نوسییومە. پێش هەموو کەسێك هاوڕێ ئازیزەکانی خۆم تایبەتترینەکانی ژیانم ئەوانەی کە بە قسە و بە کردار بۆمیان سەلماند کە هاوڕێن. ڕێزو سڵاوێکی وەفاداریش بۆ ئەو هاوڕێیانەی خیانەتیان کرد لە پاکی و بێگەردی پەیوەندییەکەیان!!

من لە تەمەنێکی کەمی گەنجیدام بەڵام ئەم کتێبە وەك جوانترین ئەزموون و یادگاری بۆ ژیانم دەنوسمەوە. لە کۆتایدا هیواخوازم ئەوانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوە چێژی لێ وەربگرن و خۆشترین یادگارییەکانیان بهێنێتەوە یاد.

نوسەر

# هاوڕێ

مـرۆڤ دوای ئەوەی دەگـاتە تەمەنـێـک، کەلە کـۆمەڵـگەی خێزانەکەی دێتە دەرەوە ئـاشـــنـای کۆمەڵگەی دەرەوە دەبێت، هەوڵدەدات خۆگونجاندن دروســـت بکات لەنێوان خۆی و ئەو کەســـانەی، کەلەدەوروبەریدان وردە وردە هەوڵی دروســـتکردنی پەیوەنـدی دەدات لە نێوان خۆی و هـاوپۆلەکانی لە قوتـابخـانە دواتریش لە نێوان خۆی و مامۆستاکانیدا.

ئەوکـاتە لەگەڵ پێویســـتی بۆ خوێنـدنەکەی و قســـەکردن و تێکەڵبوون دەتوانێت کەسێک، وەک هاوڕێی خۆی دەستنیشـان بکات.

لەگەڵ گەورەبوونی تەمەنیـدا و بڕینی قۆنـاخەکـانی خوێنـدن ئـاشـــنـابوونی بە خەڵکی زیـاتر دەبێـت و هەســـتکردن بە بەرپرسیاریەتی لا گەورەتر دەبێت.

کاتێکیش کەدەگاتە قۆناخی زانکۆ و پەیمانگا و دەبێتە خاوەنکار دەبێت بزانێت کە کێ وەک هاورێی نزیک هەڵدەبژێرێت بێگومان کاتێک لەو قۆنـاخەدایت پێویســـتت بە نـاســـین و تێکەڵبوونە لەگەڵ خەڵکی زیـاتر بۆ ئەوەی شـــتی زیـاتر دەربـارەی هەموو بوارێک و هەموشـــتێک بزانی و فێربیت و پەیوەندی هاورێیەتیت بەهێز دەبێت و دەبیتە کەســـێکی پەســـند لای هەمووان، بەڵام

کاتێک کەخۆت بەدوور دەگری لەهاوپۆلەکانت تێکەڵی کەسانێکی زۆر نابیت دەوروبەرەکەت واهەستدەکەن، کە کەسێکی لەخۆبایت، یان خۆبەزلزانی ئەگەر کەسایەتیت لە ڕاستیشدا وانەبێت ئەوان وا هەڵتدەسەنگێنن.
بۆیە پێویستە هەم کەسێکبیت کە کەسایەتی خۆت بپارێزی هەم پێویستە تێکەڵبونێک لەنێوان تۆو دەوروبەرت هەبێت بەڵام لە سنورێکی دیاریکراودا چونکە تۆ پێویستت بە ئەوان دەبێت جا بە هەر هۆکارێک بێت بەهۆی کارەکەت یان خوێندنەک ەت.



## هونەری هاوڕێ گرتن:-

١-ئەگەر دەتەوێت خەڵکی گرینگیت پێبدەن و خۆشیان بوێیت ئەوا پێش ئەوە خۆت گرینگیان پێبدەو خۆشەویستی خۆتیان بۆ دەربڕە ئەوکات دەبینیت، کە ئەوانیش گرینگیت پێدەدەن.

٢-هەمیشە دەم بە خەندە و ڕووخۆشبە هەوڵبدە کە بە زەردەخەنەکانت سەرنجی بەرامبەرەکەت ڕاکێشی و خۆشیان بووێیت.

٣-مرۆڤ ناوەکەی لە هەموو شتێك لا خۆشەویسترە بۆیە هەوڵبدە ناوی کەسەکان لەبەربکەی، کە دەیانبینیت و لەکاتی قسەکردندا بەزۆری ناویان بهێنیت چونکە پێی خۆشحاڵ دەبن.

٤-هەمیشە قسە لەسەر ئەو بابەتانە بکە کە حەزوو خولیای بەرامبەرەکەتە، بۆ نمونە ئەگەر ئەوکەسە مامۆستایە ئەوا هەوڵبدە دەربارەی ئەو شتانە قسە بکەیت کە پەیوەندی بە پسپۆڕیەکەیەوە هەیە، وەك پرسیار دەربارەی ئاستی خوێندن و گرینگی پەروەردە لە قوتابخانەکان و هتد.

٥-گوێگرێکی باشبە و بهێڵە بەرامبەرەکەت دەربارەی خۆی قسەت بۆ بکاو تۆش هەوڵدە کاتێك کە قسەت بۆدەکات

پرسیاری لێبکەیت دەربارەی ئەو بابەتەی کە قسەی لەسەر دەکات.

٦-وشە گەلێکی وەك (سوپاستدەکەم، ببورە، بێزەحمەت، ... ) زۆر بەکار بهێنە لە قسەکانت نیشانەی ڕێزگرتنی تۆیە لە بەرامبەرەکەت.

٧-ڕێزی بەرامبەرەکەت بگرە با وا هەست بکات کە گرینگە لەلات.

٨-واز بهێنە تا بەرامبەرەکەت قسەکانی خۆی دەکات و بەجوانی گوێی لێبگرە هەرگیز قسەی پێ مەبڕە.

٩- (بە کەسێکی باش ناوی بەرامبەرەکەت بهێنە هەوڵدەدات کەسێکی باش بێت) واتا هەمیشە وەسفی بەرامبەرەکەت بکەو هانیبدە لەو شتەی کە تیایدا کەمێك باشە بۆ نمونە، کەسێك هەندێك لە هونەری وتاربێژی باشبێت و تۆش بڵێیت بەڕاستی زۆر بە جوانی قسەت دەکرد بڕوام نەکرد بەوشێوەیە زیرەکبیت، ئەوکات ئەوکەسەش دڵی زۆر خۆشدەبێت و هەوڵدەدات ڕاهێنانی زیاتر بکات و زیاتر هەوڵی بۆ بدات و هەڵەکانی پێشوی ڕاستبکاتەوەو تێیدا سەرکەوتوو بێت تەنانەت ئەگەر خۆشی

بەم شــێوەیە بـاش نەبووبێـت، بەڵام مـانـدانەکەی تۆ زۆر گرینگدەبێت بۆی.

١٠ -کاتێك کەسێك هەڵەیەك دەکات هەمیشـە وا پیشـانی بدە، کە چارەســەری هەڵەکەی ئاســانە و هەڵەکەی لا گەورەمەکە، بەڵکو ببە بە هیوا بۆی و هانیبدە تا زیاتر خۆی باشبکات.

١١-لە قســە کردنـدا هەرگیز ڕەخنە مەگرە و لۆمە و بـاســی خراپەی کەس مەکە لەجیـاتی ئەوانە بـاســی چـاکەکانی بکە، چونکە هەرکەسـێك لە شـتێکدا لە ئێمە باشـترە بۆیە هەوڵبدە باسی ئەوشتە باشەی بکەیت.

١٢-دوربـکەرەوە لە دەمەقـاڵێ مەمـێـڵە هەرگـیـز دەمەقـاڵێ دروستبێت بەڵکو هەوڵبدە بە گفتوگۆی هێمنانە و لەسەرخۆیانە کێشەکان چارەسەر بکەیت.

١٣-هەرکـاتێـك هەڵەبوی ئەوە دان بەهەڵەی خـۆتـدا بنێ زۆر ئاســاییە هەموو کەســێك هەڵە دەکات بەوشــێوەیەش جوانتر دەبیت لەپێش چاوی بەرامبەرەکەت.
١٤ -دووربکەوە لە خۆبە زل زانی و عینادی لە گفتوگۆدا هەوڵبدە بە مێشــکێکی کراوە و فراوان بیر لە بـابەتەکان بکەیتەوەو ڕای گشتی قبوڵبکەیت.

١٥ -هەرکەس خـاوەنی بیروبۆچـونی جیـاوازی خـۆیەتی بۆیە ئاســاییە ئەگەر لەســەر بابەتێك لەگەڵ بەرامبەرەکەت هاوڕا نەبویت و ئەگەر هەڵەش بوو ئەوا ڕووبەڕوو پێی مەڵێ تۆ هەڵەیت و ڕێز لە ڕاو بۆچونەکانی بگرە.

١٦ -لەکاتی قســەکردندا هەمیشــە بە نەرمونیانی قســە بکەو دوور بکەوە لە زمانی زبری قســە کردن و توڕەیی، چونکە دەبێتە هۆی نەمانی متمانە و خۆشەویستی خەڵکی.

١٧ -هەوڵبدە هەمیشە خۆت لە جێگەی بەرامبەرەکەت دابنێیت و پاشــان بڕیار بدەیت لەســەر کێشــە و مەســەلەکان، چونکە لەوانەیە هەق بە ئەوبێت و تۆ هەســت نەکەیت بەڵام کە لە ڕوانگەی ئەوەوە ڕوانیتە کێشەکان ئەوکات لەوانەیە لێی تێبگەیت و حەقی پێبدەی.

١٨ -لە هەڵە و کەموکورتی بەرامبەرەکەت خۆشــبە و بەرلەوەی بیر لە هەڵەی ئەو بکەیتەوە بیر لە هەڵەی خۆت بکەرەوە تا بزانی هەموو کەس هەڵە دەکات بۆیە کەس لەبەر هەڵەیەك مەسڕەوە لە ژیانت.

١٩ -کاتێـك دەتەوێـت بەرامبەرەکەت شــتێکـت بۆ بکـات ئەوا ڕاستەوخۆ، وەك فەرمان داوای ئەو شتەی لێمەکە بۆت بکات،

بەڵكو لەشـــێوەی پێشـــنیارێك دەریببڕە باشـــترە، چونكە كەس حەزناكات فەرمانی بەسەردا بكرێت.

٢٠ -هەوڵبدە ئەو شتەی، كە داوای دەكەیت لە بەرامبەرەكەت خۆشەویست و بەنرخی بكەیت لەلای وەك ئەوەی باسی گرینگی و ســـودی ئەوكارەی بۆ بكەیت تا زیاتر حەزبكات ئەو كارە ئەنجامبدات.



## چۆنیەتی هاوڕێ گرتن:-

١-دیاریکردنی ئەو کەسەی کەدەبێتە هاوڕێت:

گرینگترین شت کە پێویستە بیکەیت لەکاتی دروستکردنی هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسێک ئەوەیە، کە سەرنجی بۆ لای خۆت ڕاکێشی و وای لێبکەی کە تۆ دەتەوێت ببی بەو کەسەی کە لە ئەوەوە نزیکەو دەتوانیت لێی تێبگەیت و لە خۆشی و ناخۆشی لەگەڵیدابیت.

وە ئەوەی کە پێویستە تۆ بیزانیت ئەو ماوەیەی کە کاتی لەگەڵ بەسەر دەبەیت کاتێک، کە قسەی لەگەڵ دەکەیت بزانیت، کە ئایا ئەویش دەیەوێت ببێت بەو هاوڕێ نزیکەی کە لێت تێدەگات بە پێی کات بۆت دەردەکەوێت کە ئەو کەسێکی چۆنە، وە لێکتێگەیشتنی نێوانتان تا چەند کاریگەری دەبێت لەسەر بەهێزبوونی ئەم پەیوەندییە و دروستبوونی متمانەی زیاتر بە یەکتری هەموو ئەمانەت لە ماوەیەکی کەم بۆ دەردەکەوێت.

٢-خاڵی لێکچوون لە نێوانتان (لێکتێگەیشتن) :

دەبێت بزانیت کە خاڵی هاوبەش چیە لە نێوانی تۆو ئەوکەسەی کە وەک هاوڕێ هەڵتبژاردووە زۆر جار لێکچوونی تابەتمەندییەکانی نێوانتان دەبێتە هۆی فراوانبوونی پەیوەندی بۆ نموونە تۆ حەز بە خوێندنەوەی کتێب دەکەی هاورێکەشت

بەهەمان شێوە وەک تۆیە یان هەردووکتان ڕقتان لە سەیرکردنی فیلمە ئەوەش وادەکات کە قسەو گفتووگۆی نێوانتان زیاتر پێکبێت لە باسکردنی بابەتی بەسوودوو زانیاریدان بە یەکتری دەربارەی ئەو شتەی کە شارەزاییتان لێی هەیە.

٣ -تەواوکەری یەکتری:

زۆرجار ئەم قسەیە لەنێوان دوو هاوڕێی نزیک بەکاردێت، کە دەڵێن ئێمە تەواوکەری یەکترین لە ئەنجامدانی هەموو کارێک یان ئەگەر یەکێکمان شارەزایمان یان زانیاریمان دەربارەی شتێک نەبێت وە ئەویتر زانیاری لەسەر هەبێت ئەوا بەڕاستی دەتوانن ببن بە تەواوکەری یەکتری بۆ نمونە لە ئەنجامدانی ئەرکی ماڵەوەلەوانەیە هەریەک لەو دوو هاوڕێیەی لە یەکێک لەوانەکان ئاستی بەرز بێت بۆیە لە کاتی تاقیکردنەوە یان ئەنجامدانی ئەرکی ماڵەوە دەتوانن هاوکارێکی باشی یەکترین.



## چۆنیەتی متمانە کردن یان بەدەست هێنانی متمانەی هاوڕێکەت:-

زۆرکات بیر لەوە دەکەینەوە، کە ئایە چۆن بتوانم متمانەی هاوڕێکەم بەدەست بهێنم؟ یان چۆن من متمانەی پێبکەم و چۆن بزانم کە کەسێکی نهێنی پارێزە؟ دەتوانیت متمانەی بەدەست بهێنی کاتێک کە راستگۆ بوویت لەگەڵیدا وە کاتێک کە نهێنیەکانی خۆیت لا باسدەکات و تۆ دەیپارێزیت هەروەک نهێنیەکانی خۆت، ئەوکاتە دەتوانێت لێت دڵنیابێت کە کەسێکی باشیت و هەموو شتێک لەبەر ئەو دەکەیت.

وە تۆ دەتوانیت متمانە بە ئەو بکەیت کاتێک کە بەباشە باسی تۆدەکات لای هاوڕێکانت یانیش کاتێک کە پشتگیری تۆ دەکات لە کارێک یان لەکاتی ڕوودانی هەرشتێک.

متمانە یەکێکە لە گرینگترین پایەکانی هاوڕێیەتی لەکاتی دروستبوونی هاوڕێیەتی پتەو بناغەی مانەوەی ئەو هاوڕێیەتیەیە، کاتێک ئەو متمانەیە لەدەست دەدرێت لە لایەن هەرکام لە هاوڕێکان پێویستە هەلێکی تری بدەیتێ تا ئەویش بەهەڵەکەیدا بچێتەوەو دووبارەی نەکاتەوە، کاتێک کە هەڵەیەک بەرامبەر هاوڕێکەت دەکەیت وە دەبێتە هۆی لەدەستدانی متمانەی ئەوکاتە تۆ وا هەستدەکەیت کە خۆشەویسترین کەسی ژیانت لەدەستداوە، چونکە لەدەستدانی متمانە واتە لەدەستدانی نەک تەنیا هاوڕێکەت بگرە دەوروبەریشت.

وە ئەو شـــتەی کە پێویســـتە هەموو هـاوڕێیەک بیکەن لەکاتی نەمـانی پەیوەنـدی نێوانیـان ئەوەیە کە دەبێـت هەرچییەک لە نهێنیەکانی یەکترییە لە نێوانیان بیپارێزن و ڕێزی ئەوکاتانە بگرن کە ئەوان ڕۆژێـک لە ڕۆژان هـاوڕێی وەفـاداری یەکتری بوون وە شـانازیشی پێوە بکەن و یادگارییەکانی نێوانیان، وەک ڕێزێک لای خـۆیـان بهێڵنەوە، وە ئەگەر بەهـۆی هەڵەیەکەوە پەیوەنـدی نێوانیـان پچڕابێت ئەو هەڵەیە نەکات بە خاڵی لاوازی و کاتێـک کە بـاســیـان کرد بەخراپی لای خەڵکی بـاســینەکات، ئەگەر پرسـیاری ئەوەشـیان لێکرد کە کەسێکی چۆنە تۆ پێشـتر هاوڕێی ئەو بوویت! ئەوا وەســفی باشــیەکانی ئەو بکەو بـاســی لایەنە خراپەکانی مەکە، چوونکە لەوانەیە ئەو هەمـان ئەو کەســەی پێشـــوو نەمـابێـت، کە ئەو هەڵانەی کردووە بەڵکوو لەوانەیە ئێستا بووبێت بە باشترین کەس.



## پایەکانی هاوڕێیەتی:-

١-بەشێک لەخەڵکی مەرجی ئەوە بۆ هاوڕێیەتی دادەنێن، کە دەبێت لە ڕووی پایەی کۆمەڵایەتی یەکسانبن واتە دەوڵەمەند ببێت بە هاوڕێی دەوڵەمەند هەژاریش هاوڕێی هەژار، بەڵام ئەوە بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە، چونکە هاوڕێیەتی پەیوەندی نییە بەدەوڵەمەندی و هەژاری، بەڵکو پەیوەندی هەیە بە بەهرەمەندی لە بوارە جیاوازەکانی ژیان و لەیەکتری تێگەیشتن ڕاستە ئەو کەسەی دەوڵەمەندە پارەدارە بەڵام ئەوەی هەژارە ڕەنگە بەهرەدار بێت.

٢- یەکێکیتر لە پایە هەرە گرینگەکان بۆ دروستبوون و مانەوەی هاوڕێیەتی ڕێزگرتنە، کە تۆ پێویستە ڕێز لە هاوڕێکەت بگریت کاتێک تووشی ڕووداوێکی ناخۆش دەبێت لە پێش چاوی هاوڕێکانیترت کاتێک کە ئەوان پێی پێدەکەنن تۆ وەک ئەوان مەکە بەڵکوو پشتگیری لێبکە، بۆ نموونە هاوڕێکەت لە شوێنێکی گشتی بەردەبێتەوە و هەمووان پێی پێدەکەنن ئەوە تۆ پێویستە بڕۆیت یارمەتی بدەیت و دەستی بگریت پێی بڵێیت من هەمیشە لەگەڵت دەبم ئەوکاتە تۆ ئەوت کردووە بە دڵخۆشترین مرۆڤی دنیا.

٣-یەکێکیتر لە پایەکانی هاوڕێیەتی ڕێزگرتنە لە ڕاو بۆچوونەکانی هاوڕێکەت ئەوکاتە تۆ دەبیت بە کەسێک کە هەم ڕێزی خۆت هەم ڕێزی ئەویشت گرتووە ئەگەر بۆچوونەکانیشی هەڵەبوو ئەوە تۆ دەتوانیت بەشێوازێکی جوان پێی بڵێیت، کە بۆچوونەکەت باش نییە، وە هەرگیز هەوڵی ئەوە مەدە کەسێکی خۆپەرست بیت و ڕاو بۆچوونی خۆت زاڵ بکەیت بەسەر ڕای ئەوانیتر، چونکە ئەوکاتە هەموان ڕقیان لێتدەبێتەوە بۆیە هەمووکات هەوڵبدە کەلە ئەنجامدانی هەر شتێک کە بۆ بەرژەوەندی گشتی بوو ڕاو بۆچوونی هەموان وەرگریت ئەوکاتە هەموان سوپاستدەکەن و دەستخۆشیت لێدەکەن.

٤-یەکێکیتر لە پایەکانی هاوڕێیەتی بریتییە لە خۆت کە ئایە تۆ لە ڕووی ڕەفتارەوە کەسێکی نەرموونیانیت یان کەسێکی توڕە و زوو هەڵچویت پێویستە کەسێکی نەرمونیان بیت تا لای هەموان خۆشەویست بیت، هەروەها پێویستە کەسێکی سادەبیت و جیاوازی نەکەیت لە نێوان هیچ کەسێک وە بەبێ جیاوازی یارمەتی هەموان بدەیت.

٥- یەکێکیتر لە پایەکان ئەوەیە کە هەوڵبدەیت هەرشتێکی باش، کە خۆت بەدەستی دێنی بەهەمان شێوە بۆ هاوڕێکەشت پێت خۆشبێت کە بەدەستی دێنێت ئەوکاتە تۆ بە کەسێکی

خۆپەرستوو بەخیل دانانرێیت بەرامبەر هاورێکەت بەڵکوو باشترینی ئەوبوویت، چونکە یەکێک لە دەردە کوشندەکانی ئەو سەردەمە خۆپەرستییە خەڵکانێکی کەم هەیە کە هەستی خۆپەرستی لە ناخیدا نەبێت.



## ڕاز و نیازی هاوڕێیەتی:-

مەبەستم لە ڕاز ئەوەیە کە تۆ چۆن بیر لە هاوڕێکەت دەکەیتەوە یان بەکەسـێکی چۆن مەزندەی دەکەی لە مێشـکی خۆتدا یان ئەگەر خەڵک پرسـیارت لێبکەن کە ئەو کەسـێکی چۆنە چۆن وەڵامیان دەدەیتەوە؟

تۆ پێویسـتە لەسـەرت هەمووکات هاوڕێکەت بەرز بنرخێنی لای هاوڕێکانیترت و لای خەڵکیتر ئەگەر هەڵەیەکیشـی هەبوو ئەوا پێویسـتە لەسـەر تۆ ئەو هەڵەیەی بۆ پەردەپۆش بکەی وە پێی بڵێیت کە هەڵەکەی چابکات چونکە لای خەڵک پەسـند نییە، وە ئەگەر تۆ وابکەیت لەگەڵ هاوڕێکەت ئەوا تۆ ڕێزی ئەو هاوڕێیەتیەت گرتووە و پاراستووتە ئەویش زیاتر خۆشـیدەوێی و گرینگیت پێدەدات وە لە ڕۆژە خۆش و ناخۆشەکان ئەو لەگەڵت دەبێت.

ڕازی هاوڕێیەتی داوای زۆر شتی ئەرێنیت لێدەکات کە گرینگە تۆ هەموو کات پاڵپشـت وکاریگەر بیت بۆ دەوروبەر و هاوڕێکانت پێویسـتە هانیان بدەیت لە ئەنجامدانی هەر کارێکی باش وە ڕێگریان لێ بکەیت لە ئەنجامدانی کاری خراپە، هەوڵبدەیت کە ڕەفتارە خراپەکانیان لێ دوور بخەیتەوە وەک (خۆپەرسـتی، خۆبەگەورەزانی، ڕق، چەندین ڕەفتاریتری نەشـیاو) ئەگەر

هەریەکەمان هەوڵ بۆ ئەوە بدەین کە بەرامبەرەکەمان رابێنین لەسەر ئەوەی کە کاری خراپ ئەنجام نەدات وە قسەی خراپ نەکات لەبەرامبەر هەر کەسێک لە کۆمەڵگە ئەوا تۆ کۆمەڵگات پاراستووە لە زۆر شت.



## وەفای هاوڕێیەتی:-

وەفاداری یەکێکە لەو سیفەتانەی، کە وا لە مرۆڤ دەکات خۆشەویست بێت لای هاوڕێکانی و لای خەڵکی.
وەفای هاوڕێیەتی کاتێک دەردەکەوێت، کە تۆ تەنها لەکاتی خۆشیەکان لای هاوڕێکەت نیت بەڵکو ئەوکاتانە لای ئەو دەبیت، کە پێویستی پێت هەیە و تووشی ناخۆشیەک بووە، ئەگەر نمونەیەک بهێنینەوە لەسەر سیفەتی وەفاداری پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم، لە جەنگی بەدردا کاتێک پێغەمبەری خودا صلى الله علية وسلم ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی کرد بە تەماشا کردنی گۆڕانکاریەکانی ناوچەکە، پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم یەکەمین دانیشتنی شورای باڵای لە ئیسلامدا ڕێکخست، دۆخەکەی بۆ یارو یاوەرانی خۆی باسکرد و بۆی ڕونکردنەوە، پێکەوە دیدگایان گۆڕیەوە، گروپێک لەوان دڵیان کەوتبوە لەرزە دەترسان لە هەیبەتی جەنگ، بەڵام ابوبکر هەستایەوەو قسەگەلێکی ڕێکو جوانی کرد پاشان عومەر هەستایەوەو قسەی باشی کردو دواتر میقدادی کوڕی عەمر هەستایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم، ئیمە وەک نەوەکانی اسرائیل پێت ناڵێین (بڕۆ خۆت و خوداکەت شەڕیان لەگەڵ بکەو ئێمەش لێرە دادەنیشین) بەڵکو ئێمە دەڵێین : بڕۆ

ئێمەش لەپشتی تۆین، سوێند بەخودا ئەگەر بماننێریت بۆ (بەرکول غیماد کە لە یەمەنە) ئەوا بەبێ سێ و دوو بە شمشێرەوە لەگەڵت دێین، پاشان پێغەمبەری خوداش صلی الله علیە وسلم قسەی باشی بۆ کردن و دوعای خێری بۆ کردن.

کە ئەمە وەفاداری هاوەڵەکانی پێغەمبەرە صلی الله علیە وسلم کە وەک نەوەی اسرائیلیان نەکرد موسا بەتەنها جێ بهێڵن بەلکو لەپشتی پێغەمبەرەوەصلی الله علیە وسلم وەستان.



## هاوڕێ دەبێتە هۆکار بۆ سەرکەوتنەکانت:-

هەریەکە لە ئێمە بۆ ئەنجامدانی هەر کارێک، کە بمانەوێت بیکەین و حەزوو خولیامان لێی هەیە و لێی بەهرەمەندین ترسێکمان بۆ دروست دەبێت لە ئەنجامدانی.

یان ترس لە قسەی خەڵکی، کە دەترسیت قسەی خەڵک کارت تێبکات و پەشیمانت بکاتەوە لە ئەنجامدانی ئەوکارەی کە خۆت خولیاتە دەتەوێت پێی بگەیت، یانیش ترس لە بەدەست نەهێنانی ئامانجەکەت لەوەی کە تۆ زۆرترین هەوڵی خۆت بدەیت و نەتوانیت بەدەستی بهێنی واتە هەوڵەکانت بێ سودبوون، لەوکاتەدا بۆ ڕزگاربوون لەو ترسانەو ترس لە زۆر شتیتریش پێویستت بە پاڵپشتیەکی گەورەیە نەک لە ناو خێزان پێویستت بە کەسێکی دەرەوەی خێزانەکەتە ئەویش کۆمەڵگایە پاڵپشتێکت هەبێت کە بەردەوام قسەت لەگەڵ بکات و هانت بدات، چونکە کاتێک ئەو ترسانە کار لە تۆ دەکات تۆ بە خۆت دەڵێیت من کەسێکی سەرنەکەوتووم کەسێکی شکستخواردووم کەسێکم، کە ناتوانم هیچ کاتێک بە ئامانجەکانم بگەم ئەوکاتەی تۆ ئەو بیرکردنەوانەت دروستکرد ئەوە بەڕاستی تۆ ناتوانیت بیکەیت، چونکە تۆ خۆشت بوویت بە هۆکاری دروستبوونی شکست لە خۆت، بەڵام کاتێک هاوڕێکەت

بەردەوام پێتبلێت تۆ سەرکەوتوویت دەتوانیت ئەو کارە بکەیت وە هانت دەدات بۆ ئەوەی تۆ هەوڵی بۆ بدەی بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکەیت، ئەوکاتە تۆ هەست بە متمانە بەخۆبوونێکی گەورە دەکەیت لە ناختدا وە بە خۆت دەڵێیت کە وشەی مەحاڵ بوونی نییە من دەتوانم هەموو شتێک بکەم، کە لە توانامدا هەیە ئەوکاتە هەستەکانت واتلێدەکەن کە تێبکۆشیت و هەوڵبدەیت بۆ بەدەستهێنانی وە لە ئاست قسەی خەڵکی گوێیەکانت نابیستن وات لێدەکات سەربکەویت و بگەیت بە خەون و ئامانجەکەت وە بەدەستی بهێنی، ئەوکات بە هەمووانی نیشاندەدەی، کە هیچ کات وشەی مەحاڵ بوونی نییە و منی ئادەمیزاد خودا وای خولقاندووم کە توانام بەسەر هەموو شتێکدا هەبێت و ڕێچکەو ڕێگرەکانی بەردەم سەرکەوتنم تێکبشکێنم.



## ببە بە هاوڕێی ڕۆژە ناخۆشەکان:-

هەرکەسێك ئەگەر بیەوێت لای خەڵکی و هاوڕێکانی پەسند بێت ئەوا پێویستە لەکاتی ناخۆشیەکانیان هاوکار و هاو خەمیان بیت.

ئاساییە ئەگەر لە ڕۆژە خۆشەکانی ژیانیشیدا نەیتوانی لەگەڵی بیت بەڵام ئەو کاتە هاڕێ پێی دەوترێت هاوڕێی ڕاستەقینە کە توشی ناخۆشیەك دەبێت و دێت بە هانایەوە، ئەوکات هاوڕێکەت هەست بە هەبونی کەسێك دەکات لە ژیانی کە لەخەمی ئەودایەو دەیهەوێت یارمەتی بدات وە هەست بە دڵخۆشیەکی زۆر دەکات، نمونەی هاوڕێ یان مرۆڤی باش کاتێک دەردەکەوێت کە توشی ڕووداوێک دەبیت و یان کەسێکی ئازیز لەدەست دەدەیت ئەو بەوپەڕی گرینگی پێدان و دڵدانەوەت لەلات دەمێنێتەوە تاوەکو بەسەر هەموو ناخۆشیەکان و ئاستەنگە قورسەکانی ئەو ڕووداوەدا زاڵ دەبیت خودای گەورە هەموومان بە ئازارەکانی ژیان تاقیدەکاتەوە تاوەکو ببێتەوە وانەیەکی ئاگادارکەوە بۆ ئێمە کاتێک بەسەر ئاستەنگەکاندا زاڵ دەبیت ئەوکاتە بەهێزی خۆت بۆ دەردەکەوێت.

دەڵێن مرۆڤ لەژیانی هەتا ناخۆشی زیاتر ببینێت بەهێزتر دەبێت وەک ئەوەی کە تووشی نەخۆشییەک دەبین بۆ جاری دووەم کە

دووبـاره تووش دەبینەوە بەرگری پەیـدا دەکەین بە ئـاســـانی وەریدەگرین و تێدەپەڕێت، بۆیە پێویستە لەسـەر ئێمە، کە نرخی هاوڕێیەتی بەرز بنرخێنین، چونکە کاتێك تۆ ئاوا باشـــدەبیت بۆ هـاوڕێکەت و کەســـە نزیکەکانی ژیانـت یـارمەتی دەدەیـت تۆش ڕۆژێك دێت، کە پێویستت بەوە دەبێت کەسێك یارمەتیت بدات و لات بێت، چونکە هەمووومان لە ژیانمان توشی ناخۆشی دەبین و پێویستمان بە کەسێك دەبێت، کە یارمەتیمان بدات.



## ڕق و كینە:-

ڕق هەستێكە، كە دەبێتە هۆی دوورخستنەوەت لە خەڵكی و خۆبەزل زانی.

ڕق و كینە هەندێكجار لە بنەڕەتی پەروەردەی دایك و باوك وە هەندێك جاریش بەهۆی جیاوازی لە ڕاوبۆچون و قبوڵنەكردنی ڕایەكانی یەكتری ڕوودەدات، هەریەكەمان بەشێوازێك و لە ژینگەیەكی جیاوازی خێزاندا پەروەردەبوین، هەربۆیە هەندێك جار ڕق و كینە دەبێتە هۆی (قبوڵنەكردنی یەكتر و ڕكابەرایەتی و توانج و قسەی ڕەق)، بۆ نمونە كاتێك تۆ لەگەڵ هاوڕێكانت پلان بۆ گەشتێك دادەنێن و لەسەر ئەوە كێشەدروست دەبێت كە بۆ گەشتەكەیان سەردانی كوێ بكەن لەو كاتانەدا ناكۆكی دەكەوێتە نێوانتان وە بۆ ئەوەی ئەو شتە ڕوونەدات پێویستە بڕیار لەسەر شوێنەكە بدرێت بە دەنگی زۆرینە شوێنەكە دیاریبكرێت، هەتاوەك و كەس قسەی خۆی نەسەپێنێت بەسەر قسەی ئەوانیتر، چونكە ئەگەر وابێت هەموان ڕقیان لەو كەسە دەبێتەوە، وە بۆ ئەوەی خەڵك ڕقی لێت نەبێتەوەو خۆشیانبوێت پێویستە ڕێز لە ڕاو بۆچونی هەموو كەسێك بگریت، ئەو نمونەیە لەسەر هاوڕێیەتی نیە بەڵام نمونەیەكی زۆر جوانە بۆ نیشاندانی ڕكابەرایەتی و دژایەتی كردن هەموومان

ئاشـناین بە چیرۆکی پێغەمبەر یوسـف سـەلامی خودای لێبێت، کاتێک کە یوسـف سـەلامی خودای لێ بێ خەونی بینی باوکی بەڕێزی پێغەمبەر یەعقوب پێی فەرموو، کە خەونەکەت بۆ براکانت مەگێڕەوە وە براکانی یوسـف سـەلامی خودای لێبێت لە نێوان خۆیان هەستیان بەوە دەکرد کە باوکیان یوسفیان لەمان خۆشـتر دەوێ بۆیە لەنێوان خۆیـان کەوتنە دژایەتی کردنی یوسـف و بریاریـاندا بیکوژن بەڵام یەکێکیـان وتی مەیکوژن و بیخەنە ناو بیرەوە.

رق و کینە وا لە مرۆڤ دەکا کەوا شـتگەلێکی وا خراپی بەدوادا بێت، کە ژیری قبوڵی نەکات ئەمـان برای یوسـف بوون برای خوێنی یوسـف بوون بەلام ڕق و کینە وای لێکردن کەبیر لە کوشـتنی براکەیان بکەنەوە، جا ئەگەر ڕق و کینە لە نێوان دوو هاوڕێدا دروست بێ دەبێ چ شت گەلێکی خراپ و مەترسیداری لێ دروست بێ؟



## ڕاوێژ کردن :-

ئێمەی مرۆڤ هەرکاتێك دەمانەوێت کارێك بەشـــێوەیەکی باش ئەنجـام بـدەین یـاخود توشـی ڕوداوێـك دەبین و دەمـانەوێـت بەشـێوەیەکی باش چاکیکەینەوە ئەوا پێویسـتمان بە ئەوەیە کە کەســێك یان کۆمەڵە کەســێك هاوکار و یاریدەدەرمان بێت، تاوەکو کارەکە بەشێوەیەکی جوان و باش ئەنجامبدەین.

ڕاوێژ کردن تەنهـا لە کـاری تـایبەت بەکـار نـایەت هەتـاوەك و خەڵکیتر یـارمەتیـت بـدەن و هـاوکـارتبن، بەڵکو ڕاوێژ دەبێـت بکرێت لە هەر کارێکی بە کۆمەڵ کە پەیوەنـدی بە بەرژەوەنـدی گشـــتی هەبێـت، بـۆ نـمـونە لە وڵات کـاتـێـك کە ســـەرۆك هەڵـدەبژێردرێت پێویســـتە هەموو هـاوڵاتییەك دەنـگ بـدات و ئەوکەســـە هەڵبژێرێـت کە پێیوایە شـــایســـتەی ئەوەیە ببێتە سەرۆك و خزمەتێکی باشی وڵاتەکەی دەکات.

هەروەك و پێشـــەوای موســـڵمانان محمد (د.خ) لە جەنگی ئحود پـابەنـد بوو بە ڕاوێژ کردن لەگەڵ هـاوەڵەکـانیـدا ئەگەر چی پێچەوانەی بۆچوونی خۆی بوون، کە لەو جەنگەدا شـکسـتیان هێنا وە هۆکاری بنەڕەتی شکستە سەربازیەکە بەهۆی لە فەرمان دەرچـونی هەنـدێـك لە هـاوەڵان و چـۆڵـکـردنی شـــوێـن و ســـەنگەرەکانیان بوو، ســـەرەڕای ئەوەی کە شـکسـتیان هێنا نە

خودا و نە پێغەمبەر (د.خ) سەرزەنشتی هاوەڵانیان نەکرد لەسەر ئەوەی بەهۆی ڕای ئەوان دووچاری شکست بوون، بەڵکو لەبەر بایەخی گەورەیی ڕاوێژ وەك بەهاو بنەمایەکی دەسەڵاتداری لە ئیسلامدا خودای گەورە سەرلەنوێ فرمان بە پێغەمبەر (د.خ) دەکات کە نابێت ئەو هەڵەو بەرئەنجامە وابکات کە واز لە بەهای ڕاوێژ بهێنێت، بۆیە دوای ئەوەش دەبێت لە کاروبارەکانیان هەر ڕاوێژیان لەگەڵ بکەی.

هەر بۆیە لەسەر ئێمە پێویستە کە بە یەکسانی و بە کۆمەڵ بڕیارە گشتییەکان دەربکەین جا ئەگەر بڕیارەکە دەربارەی بچوکترین کاریش بێت ئەگەر بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵەیەك بوو ئەوا پێویست ڕاوێژ بە یەك بە یەکی ئەندامانی کۆمەڵەکە بکرێ هەتاوەك و خودا و دەوروبەریش لە خۆمان ڕازیبکەین.



## ئیرەیی بردن بە سەرکەوتنی هاوڕێکەت :-

ئیرەیی بردن یان بەخیلی بە هاوڕێکەت دەبێتە هۆی ئەوەی، کە تۆ لە پەیوەندی هاوڕێیەتی شکست بهێنی، چونکە کاتێک تۆ بەخیلی بە ئەو دەبەی واتە دانت بە ئەوە داناوە، کە ئەو توانایەی ئەو هەیەتی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە تۆ نیتە، وە کاتێك مرۆڤ ئیرەیی دەبات ئەوکاتە خۆبە گەورەزان و لەخۆبایی دەبێت کاتێك، کە هاوڕێکەی باسی دەستکەوتی سەرکەوتنەکانی دەکات ئەو پێی تورە و هەراسان دەبێت، ئیرەیی بردن تەنها لەنێوان هاوڕێ ڕوونادات بگرە لە نێوان خوشك و براش ڕودەدات.

وە ئیرەی بردن چەندین جۆری هەیە لەوانە ئیرەیی لە: (خۆشەویستی، زیرەکی، دەستکەوتنی پارەی زۆر، هتد..)

یەکێك لە نمونەکان ئیرەیی بردنە کاتێك دایك و باوك جیاوازی دەکەن لە نێوان منداڵەکانیان لە دەربڕینی خۆشەویستیەکی زیاتر بۆ یەکێکیان ئەویتر ئیرەیی پێدەبات زۆر جار دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕق و کینەیەك لە دڵی منداڵەکەیتر کە ئەو ڕقە لەگەڵی گەورە دەبێت و بەناو کۆمەڵگادا دەڕژێت.

ئیرەیی بردن زۆرکات لەنێوان هاوڕێدا ڕودەدات بەهۆی زۆر شت، کە هۆکارن یەکێك لە هۆکارەکان مامۆستایە کاتیك زیاتر گرینگی بە قوتابییەکی دەدات و هەرچی لە مامۆستاکەی داوا بکات ڕەتی

ناکاتەوە ئەوکات هەست بە تورەیی و ئیرەیی بردنێکی زۆر دەکات وە وادەکات کە ئەو خوێندکارە ڕقی لە مامۆستاو لە هاوڕێکەی و لە وانەکەش بێتەوە بەو کارەش زیان لە خۆی دەدات، هەربۆیە پێویستە لەسەر مامۆستا، کە بەیەك چاو سەیری خوێندکارەکانی بکات و هەموویان بە ڕۆڵەی خۆی بزانێت، دایك و باوکیش ڕۆڵکی بەرچاو دەبینن لە چارەسەرکردن یان دروست نەبوونی ئەو هەستە لەلایەن منداڵەکەیانەوە.



## هەوڵدان بۆ فێربوون لە هاوڕێکەت:-

بێگومان هەموو کەسێک کۆمەڵێک تایبەتمەندی یان خووی باش و خراپی هەیە.

بۆیە کاتێک تۆ کەسێک دەکەیت بە هاوڕێت هەوڵبدە خووە باشەکانی لێوەربگریت و لێیەوە فێربیت بەڵام ئەگەر خووێکی خراپی هەبوو هەوڵبدە، کە یارمەتی بدەیت تا ئەویش لەو شتە ڕزگاری بێت.

بۆ نمونە هاوڕێکەت کەسێکە کە هەمووکات بە خراپ باسی خەڵکت لادەکات تۆ هەوڵبدە کەتێی بگەیەنی و پێی بڵێیت، کە ئەوە شتێکی هەڵەیە ئێمە نابێت ڕق و کینە لە دڵماندا بچەسپێنین و تێکەڵی ژیانی تایبەتی خەڵکانیتر ببین، چونکە سەرچاوەی کاری خراپە و دەبێتە هۆی تێکدانی پەیوەندی نێوان خۆت و دەوروبەر تۆ پێویستت بە دەوروبەرو کۆمەڵگاکەتە بۆیە تا دەتوانیت هەوڵبدە هاوسەنگیەک دروست بکەیت لە پەیوەندی نێوان خۆت و دەوروبەر.

وە هەوڵبدە ئەوەی دەیزانیت و سودی بۆی هەیە پێی بڵێیت ئەوکات هاوڕێکەت هەستدەکات کە تۆ خەمی ئەوتەو بیر لە باشەی ئەو دەکەیتەوە، وە زیاتر متمانەت پێدەبەخشێت و باسی هەموو شتێکی خۆیت لا دەکات.

وە گرینگیدان بەو بوارانەی کە شارەزایت لێی هەیە هەوڵبدە کە بزانیت خۆت و هاوڕێکەت لە چ بوارێکدا شارەزایتان هەیەو

تێیدا بەهرەمەندن، چونکە هەموو مرۆڤێک کۆمەڵێک بەهرەی شاراوە لە ناخیدا هەیە، کە لەوانەیە خۆشی هەستیان پێنەکات. تا ئەوکاتە خۆی هەوڵدەدات و دەبێتە هۆی سوود گەیاندن بە خۆی و دەوروبەری هەر وەک کەسێک کە هەستێک وای لێبکات کە پێی بڵێت تۆ پێویستە ئەو شتە ئەنجامبدەیت وە کاتێک تاقیدەکاتەوە دەبینێت ئەنجامی کارەکەی سەرکەوتنە لەو بوارەدا بۆ نمونە کەسێک هەستدەکات کە ئەو لە بواری وێنەکێشان دەتوانێت سەرکەوتووبێت کاتێک تاقیدەکاتەوەو وێنەیەک دەکێشێت دەبینێت کە خەڵکێکی زۆر پێی دەڵێن دەستخۆش زۆر جوانت کێشاوە بەردەوامبە واتە هانیدەدەن بۆ بەردەوامبوون، کاتێک کە خەڵکی هانتبدات لە ئەنجامدانی کارێک ئەوا بە دڵنیاییەوە تۆ لەو کارەت سەرکەوتوو دەبیت هاندانی خەڵکی دەتبات بەرەو ئەو ئامانجەی، کە هەتە یان ئەو بەهرە شاراوەیەی، کە لە ناختدا هەیەو ترست هەیە لە دەرخستنی.



## کاریگەری هاوڕێی دیندار و خواناس لەسەر هاوڕێکەی:-

کاریگەری هاوڕێی دیندار و خواناس لەسەر هاوڕێکەی هەروەکو چۆن دەزانین هەڵبژاردنی هاوڕێی باش کارێکی ئاسان نییە بۆئەوەی بتوانین بەئاسانی هاوڕێی باش بدۆزینەوە وە ئەو هاوڕێیەی، کە دەتوانین پشتی پێ ببەستین و لەکاتی تەنگانەدا بەتەنها جێمان نەهێڵێت, یەکەم شت پێویستە لە لایەنی دینی ئەوکەسە بکۆڵینەوە , وە لێکۆڵینەوە لەوەش زۆر ئاسانە چونکە کەسانی دیندارو نزیک لە خودا زوو دەناسرێنەوە وەکو خوا سبحانە وتعالى دەفەرموێ: (سيماهم في وجوههم من أثر السجود) واتا :سیمای ئەو جۆرە کەسانە لە ڕووخساریان دیارە بەهۆی شوێنەواری سوجدەبردنیان ,وەکاتێک ئەو کەسەشت دۆزیەوە هەوڵ بدە بەباشی خۆتی لێ نزیک بکەیەوە، چونکە هاوڕێی دیندارو خواناس سەرباری ئەوەی کە لەدونیادا سودت پێ دەگەێنێ بەهەمان شێوە لە قیامەتیشدا سودت پێ دەگەیەنێ، وە هەر کاتێک دوو کەس دەبن بە هاوڕێ پێویستە لەسەر بناغەی خۆشەویستی بۆ خودا ببن بە هاورێ، واتا هەر کەسێکت خۆشویست پێویستە لەبەر خودا خۆشت بوێ وە ئەگەر ڕقت لە کەسێکیش بوو پێویستە لەبەر خودا ڕقت لێی بێت، خودا سبحانە و تعالى لە قورئاندا لە سورەتی الزخرف دەفەرموێت: (الأخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو الا المتقين) واتا: هەموو دوو هاورێیەک لە ڕۆژی دوایی دا دەبن بە دوژمنی

یەکتر جگە لەو کەسانەی کە لەبەر خودا یەکتریان خۆشویستوە، وە ئەو دوو هاوڕێیەی، کە خۆشەویستی خودا کۆی کردونەتەوە هەر ئەو کەسانەن، کە خودا لەڕۆژی دوایی دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە.

پویستە بە هەموو شێوەیەک خۆمان بپارێزین لە هاوڕێی دوور لە دین و دوژمنی خودا، ئەگەر دەتەوێت بزانی لە هاوڕێی دور لە دین چ زیانێکی خراپی هەیە ئەوا گوێ بۆ ئەم نمونەیە بگرە (یەکێک لە بێباوەڕەکانی سەردەمی رسول الله (د.خ) ڕۆژێک هاتە لای رسول الله (د.خ) و وتی دەمەوێ موسڵمان بم پێغەمبەری خوداش (د.خ) بانگهێشتی ناو ئیسلامی کردو فێری شاتیەتومانی کرد، بەڵام ئەم پیاوە تازە موسڵمان بووە هاوڕێیەکی هەبوو کە زۆر ڕقی لە خودا و پێغەمبەری خودا و ئیسلام و بوو وە بەهەموو شێوەیەک دژایەتی دینی خودای دەکرد، کاتێک هەواڵی پێگەیشت هاوڕێکەی موسڵمان بووە هات بۆلای هاوڕێ تازە موسڵمان بووەکەی و پێی وت ئەگەر پاشگەز نەبیتەوە لە موسڵمان بونت ئیتر من هاوڕێیەتیت ناکەم، پیاوە تازە موسڵمان بووەکەش لەبەر خۆشەویستی بۆ هاوڕێکەی و ترسان لەوەی کە لەدەستی بدا بۆیە پاشگەز بۆوە لەموسڵمان بونی و بۆ جارێکی تر گەڕایەوە ناو بازنەی بێ باوەڕی , لەدوای ئەم ڕوداوەوە خودای گەورە سبحانه وتعالى ئایەتێکی دابەزاند لە قورئان و لە سورەتی الفرقان و فەرمووی: (و یوم یعض الظالم على یدیه یقول یلیتنی اتخذت مع الرسول سبیلا یویلتی لیتنی لم اتخذ فلانا خلیلا)

واتا: ڕۆژێک دێت، کە ستەمکار قەپ بە دەستی دا دەکات دەڵێ خۆزگە ڕێگای پێغەمبەرم بگرتایە هاوار بۆ خۆم خۆزگە فڵان کەسم نەکردایەتە هاوڕێی خۆم) ئەو کەسەی کە لە دینەکەی پاشگەز بۆوە لەبەر خاتری هاوڕێ بێ باوەڕەکەی لەڕۆژی دوایی خۆزگە دەخوازێ کە هاوڕێیەتی ئەوکەسەی نەکردایەو ڕێگای پێغەمبەری بگرتایە بەڵام ئەو خۆزگەیەی ئەو لە رۆژی دوایدا هیچ سودێکی پێ ناگەیێنێ، بەڵام ئیمە کە ئێستا لە دونیادا ین و لەدەستی خۆماندایە، کە کێ بکەین بەهاوڕێی خۆمان دەبا هەوڵ بدەین کەسانێک بکەین بەهاوڕێی خۆمان کە لە خودامان نزیک بکەنەوە و ڕێگای ئیسلاممان نیشان بدەن نەوەکو کەسانێک کەوا لە خودامان دوربخەنەوەو ڕێگای هیدایەتمان لێ ون بکەن.



## کۆپیکراوی کەسانیتر مەبە:-

هەریەکە لە ئێمەی مرۆڤەکان کەسایەتییەك هەیە کە بە کارەکانی و بە بەهرەمەندی سەرسامین، وەدەمانەوێت وەک و ئەو کارامە و شارەزایی پەیدا بکەین لە خۆماندا.

بەڵام گرینگترین شت ئەوەیە کە ئێمە دەبێت بزانین چی لێ وەرگرین؟! ئێمە پێویستە ئەزمون و شێوازی هەوڵدانەکەی لێوەرگرین، کە چۆن گەیشتووە بەوەی کە دەیەوێت.

بەڵام ئەگەر بێت و ئێمە کەسایەتی و شێواز و گفتوگۆ و جلوبەرگ و ستایلی قژ و زۆر شتیترمان وەرگرتبێت ئەوە ئێمە تەنها کۆپیکراو و لێکچوێکی وەك ئەوین و نەمانتوانیوە بە سەرکەوتووی ئەوەی دەمانەوێت بەدەستی بهێنین.

کۆپیکراوی کەسانیتر و هەوڵدان بۆ ئەوی لەوان بچیت هەندێك جار خۆنەویستانە لە مرۆڤدا ڕوودەدات ئەویش بەهۆی نزیك و زۆر تێکەڵبوون لەگەڵ هاوڕێیەکی نزیك یان لەگەڵ خوشکەکەت یان لەگەڵ براکەت.

هەندێك جار زۆر کات بەسەر بردن و ڕەفتار کردن لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکەت دەبێتە هۆی ڕوودانی زۆر شتی نەرێنی، کە کاریگەری تەواوی بەسەریەوە دەبێت، ئەگەر مرۆڤ زۆر ئاگاداری کەسایەتی خۆی نەبێت و کۆنترۆڵی نەکات ئەوا لەلایەن

هـاوڕێکەیەوە کۆنتڕۆڵ دەکرێت و ڕەفتـارەکانی ئەو بـۆتـۆ دەگوازرێتەوە کاتێك هەست بەوە دەکەیت خۆشت نازانی ئەمە چۆن ڕوویداوە.

کاتێك دەتەوێت، وەك جارانت لێبێتەوە قورس دەبێت و دەبینیت کە تووشـی زۆر هەڵەبویت و هیچ جیاوازیتان نییە و دەبن بە کۆپی یەکتر.

بەڵام هەندێك جار خوو و ڕەوشـتی هاوێی باش کارت تێدەکات و ژیانت دەگۆڕێت و وات لێدەکات کە زیاتر لە خودا نزیك بیت و دووربیت لە کاری خراپ و مرۆڤی خراپ، بەڵام لێرەش هەر دەبێت خۆتبی نابێت ڕێگە بە خۆمان بدەین ببین بە کۆپی هەر مرۆڤێك بێت باش و خراپ دەبێت خۆمان بین تەنها کردار و ڕەفتار و کارامەی و ئەزموونە باشـەکانیان لێوەربگرە بۆ ئەوەی خۆیان هەسـتی پێبکەن ئەوکاتە تۆ بە سـەرکەوتووی توانیوتە ببیتە باشترین ئەو کەسەی، کە خۆت دەتویست تێتدا ڕەنگ بداتەوە.



## تواناکانت بەکەم مەزانە:-

ئێمەی مرۆڤەکان هەریەکەمان توانا و بەهرەمەندیمان لە ئەنجامدانی کارێکدا هەیە.
هەندێك کات بەهرەکان شاراوەن لە ئێمەدا بوونی هەیە، وە خۆمان هەستدەکەین کە توانا و بەهرەمەندیمان لەو کارەدا هەیە و کارکردن لەسەر ئەو بوارە و خۆبەرە و پێش بردن و هەوڵدان بۆ دەرخستنی بەهرەمەندی دەوەستێتەوە سەر بەهرەمەندەکە.
هەوڵدان بۆ دەرخستنی تواناکان پێویستی بەکاتە تاوەکو لەسەر ئەوکارە ڕادێیت وە زۆر جار هەوڵی پاشگەزبوونەوە دەدەین لە دەستپێکردن بەو کارە، بەڵام کاتێك دەبینیت ڕێگایەکی دوورت بڕیوە زۆر سەختی و دژواریت تێپەڕاندووە دووبارە هیوا و ئومێد دەبەخشیت بەخۆت و دەڵێیت من دەتوانم من تێیدەپەڕێنم.
وە زۆرکات هاوڕێ هەندێك جاریش خێزان و نزیکەکانمان لە بێ هیوایی دامان دەبڕێنن، دەڵێن بگەڕێوە سەر هەمان ئەو بیروباوەڕەت، کە دەڵێیت من بەهێزم و بەتوانام، تێیدەپەڕێنم.
ئێمەی مرۆڤەکان پێش ئەوەی هێز و ڕێز و خۆشەویستی و متمانە لە خەڵك وەربگرین پێویستە لە خۆمانەوە دەست پێبکەین و لەخۆمانەوە وەریبگرین و بیبەخشین بە خۆمان و

دەوروبەر هەرکەسێك توانی بیروباوەڕی نوێ و نزیك بوون بەرەو سەرکەوتن لەخۆی نزیك بخاتەوە ئەوا دەتوانێت بەهەمان شێوە لە خەڵکیش وەریبگرێت ئەوکات دڵنیا دەبێتەوە لەوەی، کە ئەو هەرگیز تووشی شکست نابێت وە ئەگەر توشیببێت ئەوا تەنها ماوەیەکە و تێدەپەڕێت دووبارە بە گڕوتینێکی نوێوە دەستپێدەکاتەوە.



## هەمیشه بە ئومێدەوە لە کێشەکان بڕوانە:-

هەریەکەمان لە ژیانمان ڕۆژی خۆش و ناخۆشمان هەیە و کێشەمان بۆ دروست دەبێت دەربارەی کارەکەمان یان خوێندنەکەمان یان هەر کارێکیتر کە مەبەستتە ئەنجامیبدەی.
گرینگترین شت، کە پێویستە بیکەین، تا کێشەکەمان بە ئاسانی ببینین و بتوانین زوو چارەسەری بکەین ئەوەیە، کەبیر لە لایەنە باشەکان بکەیتەوە کە تواناو هێزت پێدەبەخشێت بۆ چارەسەرکردنی، وە دەربارەی کێشەکەت بەردەوام قسە لەگەڵ ئەو کەسە بکەیت، کە یارمەتیدەرتە و ڕێگای چارەسەرکردنی کێشەکانت پێدەڵێت یان بە قسەکردنێکی کەمیش بێت هاوکار و یارمەتیدەرت دەبێت وە پێویستە لەوکاتانە، کە کێشەت هەیە پەیوەندی نێوان خۆت و خودا نوێ بکەیتەوە و بەردەوام داوای چارەسەر لە خودا بکەیت تا ڕزگارتبێت لەو کێشەیە.
هەروەك لەم نمونەیە دەردەکەوێت ئەوکاتەی کە خوای گەورە فەرمانی کۆچکردنی بە پێغەمبەر (د.خ) دا پێغەمبەر (د.خ) لەسەر فەرمانی خودا بە هاوڕێیەتی ابو بکر ڕەزای خودای لێبێ بەیەکەوە مەککەیان جێهێشت و بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ.
لەکاتی کۆچکردنیان کافرەکانی مەککە شوێن پێغەمبەرصلی الله علیه وسلم کەوتن بۆ ئەوە بیکوژن نەهێڵن لە مەککە دەرچێ لەگەل ابو بکر چوونە ناو ئەشکەوتێکەوە، کاتێک گوێیان لە دەنگی کافرەکان بوو، کە زانیان لە ئەشکەوتەکە نزیک بوونەتەوە

ابو بكر ترسی لێ نیشت و دەترسا کەوا بگیرێن بەلام لەو کاتەدا پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) دڵنەوایی ابو بکری کردەوە و فەرمووی (لا تحزن ان الله معنا) واتە: خەفەت مەخۆ خودا لەگەڵمانە، دڵنەوایی کردەوە بەوەی پێی وت خودا لەگەڵمانە، وە ئومێدیشی دایە بەوەی کە وتی خودا لەگەڵمانە چونکە پێغەمبەر (د.خ) دەیزانی کە خودا بەندەکانی خۆی بەتەنها بەجێ ناهێڵێ بۆیە ئومێدیشی دایە ابو بکر کەخودا لەگەل ئەوانەو هەرگیز تەنهایان ناکات.

بۆیە هەرگیز بێ هیوا و بێ ئومێد مەبە دەربارەی کێشەکانت، چونکە خودا ڕێگای ئاسانمان نیشاندەدات هیچ کێشەیەك نیە کە چارەسەری نەبێت بەڵك و ئەوە خۆتی، کە بەقورسی لە کێشەکە دەڕوانی ئەگەر ئێمە وابکەین ئەوا ورەی کارکردنمان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە دادەبەزێ و لە ڕێگای سەرکەوتن دوردەکەوینەوە.



## متمانەی ناوەکی:-

ئێمەی مرۆڤ هەر کارێك ئەنجامبدەین لە هەر بوارێك لە ژیانمان ئەوە پێویستت بە متمانەی ناوەکی هەیە.
متمانەی ناوەکی واتە تۆ پێویستە پێش هەموو کەسێك و هەموو شتێك و پێش ئەنجامدانی ئەم کارە متمانەی خۆت بەدەستبێنی، خۆت باشترین پاڵپشت و ماندەری خۆتبی، ئەگەر متمانەی خۆت بەدەستبێنی ئەوا لەو کارەی، کە دەیکەیت و بەنیازیت بیکەیت دڵنیابە سەرکەوتوو دەبیت، ئەگەر لە نیوەی کارەکەشدا توشی میلاکی ماندوبون بووی ئەوە دیسان پاڵپشت و ماندەر بۆ بەردەوامبوون خۆتی، لەوانەیە دەوروبەرەکەشمان، وەك پاڵپشت و ماندەر هاوکارمان بێت، بەڵام تا بە قەناعەت و متمانە بەخۆبون نەیکەیت ئەوە قسەی ئەوانیش هیچ کاریگەری نابێت.
متمانە بەخۆبوون وات لێدەکات لەهەموو کارێك لە ژیانت، کەدەیکەیت سەرکەوتووبیت وە واتلێدەکات، کە هەنگاوی گەورەتربنێیت لە کارەکەت و داهێنانی تێدا بکەیت.
متمانە بەخۆبون دوورتدەخاتەوە لە هەموو هەستە نەرێنیەکان و ئارامی و ئاسودەیت پێدەبەخشێ و هەستی ئەرێنیت لەلا دروستدەکات.



## ببە بە کەسێکی سادە:-

ئێمەی مرۆڤەکان هەریەکەمان بە شـــێوازێك ژیـان دەکەین و خـاوەنی هەنـدێك شـــتین، ئەگەر خـاوەنی هیچ شـــتێك نەبین خاوەنی کۆمەڵە کەسێکی باشین، کە لە ژیانماندا بونیان هەیە و هۆکارن بۆ دڵخۆشبونمان.

وە ئەگەر خاوەنی کۆمەڵە شتێکیش بین هەرکەسێك لە ژیانی بە شـێوازێك مامەڵە بەو شـتە دەکات و بەکاریدەهێنێت، هەندێك لە مرۆڤەکـان نـرخی کەســـایەتی دەگەڕێننەوە بۆ هەبوون و نەبوونی هەندێك شتی کاتی و ناپێویست لە ژیان وەك (ئۆتۆمبێل و مۆبـایلی گرانبەهـا و خــانوو پـارەیەکی زۆر......) کە دەبن بە خاوەنی ئەمانە خۆیان بەســـەر خەڵکدا هەڵدەکێشـــن و پۆزی پێوە لێدەدەن، بێ ئاگا لەوەی کە کەسانێك هەن لەم دونیایە کە نەك خـاوەنی ئەم شـــتـانە نین بەڵـك و بەهۆی نەخۆشـی یـان هەژاری زۆرەوە بە قورسی ژیان دەکەن.

هەر تــاکـێـك لەم کـۆمەڵـگـایە بەهـۆی پەیـدابـونـی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان دروســـتبونی چەندین ســـایت و پەیج کە بونەتە هۆی تێکچونی پەروەردەی منـداڵ و پچڕانی پەیوەنـدی کۆمەڵاتی وە نەمانی ســیلەی ڕوحم هەر بۆیە هەر کەســێك لە ئێســتادا لە تاکەکانی کۆمەڵگە بەشـێوازێك ژیانی خۆی بەسـەر

دەبات، کە ژیانی خۆی تێکەڵ بە کەس ناکات و واز لە ڕاوبۆچونی نزیکەکانی دێنێت دەربارەی بڕیاردان لەسـەر گرینگترین کایەکانی ژیانی.

ســادەبوونی مرۆڤ هەموو جوانیەکانی ئەو مرۆڤە دەردەخات، هەربۆیە کاتێك کە دەڵێن ئەو مرۆڤە کەسـێکی ســادەیە بەبێ ئەوەی بیناسی هەستدەکەی کەسێکی پەسند و خۆشەویستە.

هەروەك چۆن هەمیشــە پێغەمبەرمان (د.خ) فەرموویەتی: «من گەورەی هەموو نەوەی ئادەمم و فەخریش ناکەم»هەمیشــە بە سادەی ڕێزی لە هەموو ئادەمیزادێك گرتووە.

هەر بۆیە نمونەی کەسـی خۆشـەویسـت و بەڕێز لەناو خەڵك مرۆڤی سادەیە.



## ببە بە کەسێکی ڕاستگۆ:-

ڕاســـتگۆ بوون یەکێکە لە جوانترین ســـیفەتەکانی مرۆڤ، وە یەکێکە لە پێوەرە دیارەکانی دیاریکردنی کەسایەتی مرۆڤەکان.

بۆیە پێویســـتە لەســـەرمان لەگەڵ کەســـە نزیك و باشـــەکانی ژیانمان هیچ شـــتێکی شـــاراوە نەبێت و بە ڕاســـتگۆیی قســـەیان لەگەڵ بکەین، ئەگەر نەمانویســـت باســـی ئەوبابەتە لای ئەو بکەین ئەوە بە ڕاستگۆی پێی بڵێت ببورە ناتوانم باسیبکەم.

چونکە ئەگەر درۆ بکەیت دەربارەی هەر بابەتێك ئەوە پەتی درۆ کورتەو ڕۆژێك دێت، کە درۆکەت ئاشـــکرادەبێت و متمـــانەی ئەوکەسە لەدەستدەدەیت.

ئەگەر متمـانەشـــت لەدەســـتدا ئەوە پەیوەنـدی نێوانتـان لاوازدەبێت یاخود ئەوپەیوەندیە نامێنێت، هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) پەروەردەی دەســـتی پێغەمبەر بوون (د.خ) بۆیە هەرگیز درۆیـان نەدەکرد وە کەســـێکیش خۆی بە موســـڵمـان بزانێت بەڕاستی درۆی لێناوەشێتەوە.

جـاریکیـان هـاوەلان لە پێغەمبەر (د.خ) یـان پرســـی: ئەشـــێت موســـڵمـان ترســـنۆک بێ فەرمووی بەڵێ دواتر هـاوەڵان وتیـان ئەشیت موسڵمان ڕەزیل بێت فەرمووی : بەڵێ.

بەڵام دواتر پرسـیان ئەشـێت موسـڵمان درۆزن بێت فەرمووی : نەخێر، کەواتە لە موسـلمان ناوەشـێتەوە کە درۆزن بێت، مرۆڤی موسڵمان و باش جگە لە ڕاستی شتی تری لە دەم دەرناچێ.
بەڵام لە هەندێك کاتدا ئێمە پێویســـتە درۆ بکەین ئەم درۆیەی کە ئێـمە دەیکەیـن درۆی ســپی پێـدەوترێـت یـاخـود درۆی مەسـڵەحەت هەندێك جار بۆ ڕزگارکردنی ژیانی کەسـێك یان بۆ چاککردنەوەی نێوان دوو کەس یان بۆ دڵخۆشـکردنی کەســە ئازیزەکان ئەم نهێنیە دەشـــاریتەوەو ڕاســـتیەکەیان پێناڵێیت تا ئەوکاتەی خۆیان بۆیان ئاشکرادەبێت و بەو کارە دڵخۆشدەبن.



## ببە بە کەسێکی یارمەتیدەر:-

هەریەکێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە شـــارەزایی لە کارێك هەیە، کە تێیدا کارامەیە، جا ئەگەر ئەوکارە پســـپۆڕیەکەی بێت یان تێیدا بەهرەمەند بێت.

ئەوکات دەتوانێت ببێت بە کەسـێکی بەسـود بۆ کۆمەڵگەکەی و یـارمەتیـدەربێـت بۆ زۆرکەس، کە پێویســـتی پێیەتی، ئەگەر هەریەکەمان بە خۆشـــەویســـتیەوە کارەکەمان ئەنجامبدەین و داهێنـانی تێـدا بکەین ئەوە دەتوانین بڵێین، کە ســـەرکەوتنی تەواومان بەدەستهێناوە لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا، پێغەمبەری خودا (د.خ) وەکو هەمومـان دەربـارەی ژیـانی ئەم پیـاوە مەزنە شـــارەزاین لەگەڵ ئەوەی گەورەی هەموو نەوەی ئادەمە لەگەڵ ئەوەی کە کۆتا پێغەمبەرە و خۆشـــەویســـتی خودایە و ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهان و خاوەنی گەورەترین رەوشـــتە، لەگەل هەموو ئەو سیفەتە مەزن و گەورانە بەلام هیچ کاتیک بە قەدەر مسقالە زەرڕەیەک لە خۆبـایی بوونی نەبووە بەردەوام یـارمەتی هەژاری دەدا.

و ســـڵاوی لە منداڵان دەکرد و جلوبەرگەکەی جیاواز نەبوو لە جل و بەرگی هاوەڵەکانی , تەنانەت لە دوعـاکانیدا داوای لە خودا

دەکرد کە لەگەڵ هەژارەکان حەشـــر بکرێ بەڕاســـتی ئەوەیە پێشەوایەک، کە پێویستە هەموومان شوێنی بکەوین.
وە هەر کارێکیش بە متمانە بەخۆبون و بەپاکی ئەنجامی بدەیت دڵخۆشت دەکات و خودات لەخۆت ڕازیکردووە.
هەرگیز کەســێکی لەخۆبای مەبە، کە لەبەر ئەوەی شـــارەزایت لەکارێکدا هەیە، بەڵکو شـــانازی بە ســـادەیی و بەو هاوکاریانەت بکە کە پێشکەشی خەڵکی دەکەیت.



## لەم ژیانە ئامانجەکەت دیاریبکە:-

ژیان زۆر لەوە کورتترە کە ئێمە هەستی پێدەکەین، کات زوو تێدەپەڕێت گەر تۆ ئامانجێك بۆخۆت دیارینەکەیت ئەوا بە بێ چاوەڕوانیکردنی هیچ ئەنجامێك ژیان بەڕێدەکەی.

یەکێك لە سەیرترین و خراپترین ڕەفتارەکان کە مرۆڤ بیکات، دووبارە کردنەوەی هەڵەکانە لەوەش خراپتر کۆڵدانە لە بەدەستهێنانی ئامانجەکەی، کاتێك بەهۆی هەر هۆکارێکەوە بێت ئەو نەیتوانی بەردەوام بێت، مرۆڤی زیرەك و بەهێز نامێڵێت خەم و ئازاری ئەمڕۆی بگات بە سبەی، شەو پێش خەوتن پێویستە بەباشی بیرلەوە بکەیتەوە کە هۆکاری میلاکبون و ساردبونەوەت چییە، کە بەرەو شکستت دەبات، سبەی کە هەڵسایتەوە بوبێت بە مرۆڤێکی نوێ و سفربوبێتەوە و خاڵیبیت لە هەموو خەم و کێشەو گرفتەکان، چەند ناخۆشە تۆ هەموو ڕۆژێك دیوارێك دروستبکەیت و بەرزیبکەیتەوە بەیانی دوای ئەوەی کە دەچیت سەیریدەکەیتەوە ڕووخاوە و سەرلەنوێ دروستیبکەیتەوە بەو جۆرە هەموو ڕۆژێك بێ ئەنجام و بێمانا ژیان بکەیت.

هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی گەورە بەوشێوەیە تا ئەو کاتەی کە خۆت دەبی بەو کەسەی کە بەخۆت دەڵێی بەسە

وازهێنان بەسە کۆڵدان ئیتر لەمەوبەدوا تەنها هەوڵدان، دیواری هەوڵدانەکانت و ئەوانەی کە بەدەستتهێناوە مەڕوخێنە تەنها لەبەر هەبوونی خەمێك کە بۆ ماوەیەکی کاتی تۆی لە ئەنجامدان و هەوڵدانت بۆ کارەکە ساردکردۆتەوە، گەر دەتەوێت بە تەواوی سەرکەوتن بەدەستبهێنی، ئەوا ژیانت پاك بکەرەوە لە خەمی دوبارە لەو مرۆڤانەی کە هۆکارن بۆ ساردبونەوەت و بەردەوام ئەتگەڕێننەوە دواوە و دورتدەخەنەوە لە ئامانجەکەت، ئەگەر تۆ بۆ ئامانجەکەت کارێکی وا بکەیت وەك ئەوە وایە کە چاویلکەکەی چاوت پیسبوبێت و پێشتر شتەکانت بە جوانی نەبینیبێ بەڵام دوای ئەوەی کە پاکت کردۆتەوە ژیانت لەلا جوان و خۆشەویست دەبێت.



## هۆکاری مردن لەدایک بوونە:-

ئەوەی لە دەوروبەرمان بەسەرمان دێت و دەگوزەرێت لە ژیانمان بە ئەندازەی ئەوە گرنگ نیە کە تێڕوانین و بیرکردنەوە و وەڵامدانەوەی ئێمە بۆ ڕووداوەکان تا چەند بیرکردنەوەیەکی دروست و ئاقڵانەیە وە تاچەند دەتوانین ئەو بارودۆخە سەختە تێپەڕێنین، کە تەنها ڕووداوێکی کاتییە بەسەرماندا هاتووە زۆرکات یەك بارودۆخ و یەك ڕووداو بۆ کەسێك دەبێتە خۆشترین و باشترین یادگاری، بۆ کەسێکیتر ناخۆشترین ڕووداوی ژیانی بەسەر هاتووە ئینجا لەدەستدانی کەسێکی نزیك و ئازیز بێت یان هەر ڕووداوێکی ناخۆش، کە هەستی ناخۆش و خەم و پەژارەمان پێبدات.

هەر شتێك دوو دیوی هەیە گرنگ ئەوەیە ئێمە بە بیرکردنەوەی ژیرانەمان کام دیوە هەڵدەبژێرین.

بۆ نمونە کەسێك زیانێکی ماددی لێدەکەوێت دەکرێت خەمبار بێت وە دەشکرێت وا بیر بکاتەوە کە ئەو دەوڵەمەند بووە و پارەی هەبووە بۆیە لەدەستیداوە و زەرەری کردووە، هەر وەك لە کەسێکیان پرسی: گەورەترین هۆکاری تەڵاق چییە؟ کەسەکەیتر وەڵامیدایەوە وتی:بێگومان زەواج.

هەر ئەمەیە، کە پێشینان وتوویانە (ئەوەی مەڕی نەبێت مردار نابێتەوە)، ئەگەر لە وانەکان نەتتوانیوە نمرەی باش بهێنی هەوڵی زیاتر بدەو ئەو دیوە ببینە، کە خودا نیعمەتی ئەوەی پێت بەخشیوە کە دەتوانیت بخوێنیت، ئەگەر لەگەڵ هاوسەرەکەت ناکۆکی ئەو دیوە ببینە کە شانسی هاوسەرگیریت هەبووە، ئەگەر

منداڵەکەت لاساری دەکات ئەو دیوەش ببینە کە خودا لە نیعمەتی منداڵ بێبەشی نەکردوویت، تەنانەت من کە چاوم دێشێت ئەوە دێت بە بیرمدا سوپاسی خودا بکەم کە چاوم هەیە.

بۆیە پێویستە ئێمەی مرۆڤەکان کاتێك لە ڕێی ژیان بەربەستێك دێتە ڕێمان نیشانەی ئەوەیە بەرەو پێش ڕۆیشتووین.

ئۆتۆمبێلی وەستاو لە هیچ تاسەیەك نادات.

هیچ کاتێك لە کەوتن مەترسە ئەو ڕێگایەی کە بەرەو پێشت دەبات پێیدا بڕۆ ئەگەر شکستت هێنا دووبارە هەوڵی بۆ بدە و مەوەستە تا پێیدەگەیت وە لەوە بترسە کە نەتوانیت و هەوڵ نەدەیت تاقیبکەیتەوە، لە کۆتایدا پێویستە بیرمانبێت تا شوێن و مەکانەتمان بەرزتر بێت و هەبووتر بین مەترسیمان زیاتر لەسەرە و بە کەوتن و هەڵدێرانمان کارەساتەکە گەورەتر دەبێت بۆیە دەبێت وشیارتر و بەئاگاتر و خۆپارێزانەتربین.



## خۆشەویستی:-

خۆشـــەویســـتی یەکێکە لەو هۆکارانەی، کە دەبێتە هۆی بەهێز بوون و مانەوەی پەیوەندییەکان.

پەیوەندی خۆشـــەویســـتی لە نێوان: (هاوڕێ و هاوســـەر ودایك و باوك و خێزان) مرۆڤ کاتێك لە ژیانی کەســـانێکی خۆشـــویســـت ئەوا ئامادەیە بۆ دڵخۆشبون و مانەوەی ئەوان لە ژیانی چی باشە بیکات وە تەنانەت دەیەوێت ئەوان لە خۆی باشتربن.

وە نهێنی بەهێزبونی پەیوەندییەکان لە خۆشـــەویســـتی ئەوەیە، کە ئەم خۆشـــەویســـتیە دەربڕدرێت ئەگەر بە زارەکی بێت یانیش بە ئەنجامدانی ئەو کارەی کە خۆشەویستانی پێ دڵخۆش دەبێت.

بۆ نمونە پێغەمبەرمان (د.خ) ئەگەر کەسێکی خۆشـــویســـتبایە یەکســـەر پێی دەوت بۆ نمونە جارێک بە معازی کوری جبلی گوت ســـوێند بەخوا من تۆم زۆر خۆشـــدەوێ معاز، وە پێویســـتە خۆشـــەویســـتی بســـەلمێنرێت واتە کاتێك کە داوای شـــتێکت لێدەکات ئەوا جێبەجێی بکەیت و قسـەی ئەو نەشکێنی و ڕێز لە بڕیار و قسەکانی بگریت.

وە کاتێك تۆ خۆشـــەویســـتی بۆ ئەو دەردەبڕیت خۆشـــەویســـتی دەبەخشـــیـت و وەریـدەگـریـت واتە بەرامـبەرەکەت وەڵامی خۆشەویستیەکەت دەداتەوە بە دەربڕین یانیش کارێك دەکات تا

تۆی پێ دڵخۆش بکات ئەوکات تۆ پێویســـتە ڕێز و قەدری ئەو خۆشەویستیە بگریت سوپاسی بکەیت و پێی بڵێیت دڵخۆشم بە بونت خودا تۆم بۆ بهێڵێت، ئەوکات تۆ دڵخۆشی بەو دەبەخشی و ئارامی و ئاسودەیش بە خۆت دەبەخشی.



## ئاسودەیی:-

مانای ئاسـوودەیی دڵخۆشـبون و هەسـتکردن بە پارێزراوی و سەلامەتیە لەلایەن مرۆڤەکانەوە ئاسودەیی ڕووحی واتە مانەوەی دڵ بە پارێزراوی و بەبێ ئەوەی زیانی پێبگات، ئاسـودەیی گیانی مانەوە و سەلامەتی جەستە بە پارێزراوی.

ئێمەی مرۆڤەکان هەریەکەمان پێویستمان بەوە هەیە ئاسودەیمان بۆ دابینبکرێت لەلایەن کەسە نزیکەکانی ژیانمان.

بەڵام هەرچەندە ئەگەر کەسێکیش هاوکار و یاریدەدەر و پارێزەرمان بێت هەندێك جار بەهۆی هەڵەی دەوروبەر یان هەڵەی خۆمانەوە ئەو ئاسـودەییەمان لێ دەشـێوێت، دەبێت قبوڵی ئەوە بکەین بەختەوەری پەیوەسـتە بە ناخی مرۆڤەوە بە ڕەهایی لایەنێکی دڵ و ڕووحی.

کاتێك تووشـی کێشـە ئەبیت دەبێت قبووڵی بکەیت، کە ئەوە ڕووداوێکە و بەسـەرت هاتووە تەنها ماوەیەکی کاتییە و تێدەپەڕێت، هیچ مرۆڤێك لە هەمان بارودۆخ نامێنێتەوە مرۆڤی بەهێز ئەوکەسـەیە، کە هەرکاتێك توشـی بەڵایەك بوو دەچێتە بەردەم ئاوێنە و بەخۆی دەڵێت: من ئەمەم، کە هەم ڕێگە بەوە نادەم ئەهریمەن ناخم بخوات ڕێگە نادەم هیچ شـتێك دەرونم نوقمی غەم و پەژارە بکا. . . بەخۆت بڵێ ئەی مرۆڤ تۆ ئەو

کەسەی فەزڵ و گەورەیت لەلایەن پەروەردگارەوە دراوە بەسەر هەموو دروستکراوانیتر ڕێگە مەدە هیچ شتێك ناخت پڕکا لە غەم ڕێگە مەدە هیچ شتێك ئاسودەییت لێتێکبدات مرۆڤی ئیماندار و لە خواترس هەمیشە ئاسودەیی میوانی دڵ ودەروونیەتی هەمیشە هەستکردن بە شانازیکردن بەخۆی لە دڵ و دەروونی پڕە.

دڵخۆشبە بە بوونت بەو جۆرەی کە هەیت پێبکەنە، خەندە بکە، چونکە تۆ لە نێوان دروستکراوەکانی خودا جوانترین و باشترینیت.



## ئارامگرتن:-

ئەگەر بژاردەی جوانترین هەستەکانی مرۆڤ بکەین ئارام گرتن لەناویاندا درەوشاوەو پڕ بەهایە, کەسانی ئارامگر هەمیشە بەرهەمێکی پڕ چێژیان هەبووە خودای گەورە مرۆڤەکان بە چاوەڕوانی زۆر و لەدەستدان و دوورکەوتنەوە تاقیدەکاتەوە, کە ئاخۆ چەندە بەهێزن چەندە متمانەیان بەوە هەیە کە خودا باشترینی بۆ داناون بەڵام لە کاتی گونجاو.

ئەو کەسانەی متمانەیان بەوە هەیە کە باشتر بەرەو ڕوویان دێت مرۆڤانێکن کە چێژ لە چاوەڕوانی وەردەگرن, بڕوایان بە قەدەری خودا هەیە دڵ گەش و ئارام دەبن بە لەدەستدان, ئەوانەی بڕوایان بە شادبوونەوە هەیە بێ هیوا نابن لە دوورکەوتنەوە.

ئێمەی مرۆڤ لەکاتی توشبونمان بە ڕووداوێك یان لەکاتی چاوەڕوانیکردمان بۆ گەیشتن بە شتێك یان بە کەسێك پێویستیمان بە هەبوونی ئارامگرتن هەیە بۆ ئەوی کە گەیشتین بەو شتە یان بەو کەسە چێژی گەیشتن ببینین، وە سەبرگرتنمان لە کاتی توشبونمان بە ڕووداوێکی ناخۆش هەستی ئەرێنیمان پێدەبەخشێت و وادەکات، کە خەمی لێ نەخۆین و بڵێین خێری تێدایە و خودا منی لە کێشەیەکی گەورەتر پاراستووە.

بۆیە ئارامگرتن سیفەتی مرۆڤی ئیماندار و لە خوداترسە وە هەر کەسێك ئارامی هەبێت لەسەر توشبوونی بە کێشەیەك ئەوا خودای گەورە پاداشتی ئەداتەوە و خۆشی دێنێتە ڕێی، وەك دەڵێن لەدوای هەموو ناخۆشیەك خۆشی دێت.

وە زۆرجار کە دەمانەوێت شتێك بەدەستبهێنین دەزانین، کە پێویستە سەرەتا هەوڵی بۆ بدەین ئینجا دوای هەوڵەکانمان و گەیشتنمان بەو شتە لەوە تێدەگەین کە بەڕاستی شایەنی ئەو چاوەڕوانییە بوو.

وە هەر شتێك بە میلاك بوون و ماندوبوون بەدەستبێت شیرین و بەچێژ دەبێت لای خاوەنەکەی.

خودای گەورە لە قورئاندا باسی ئارامگرتنمان بۆدەکات و پاداشتی ئارامگرتنیشمان بۆ باس دەکا ئەوەتا لە سورەتی البقره ئایەتی (١٥٤-١٥٥) دەفەرموێت: (الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) واتە:ئەوانەی کە کاتێک بەڵا و ناخۆشیەکیان توشدەبێت دەڵێن :ئێمە هەر هی خوداین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، لەم ئایەتەدا ئەوە فێر دەبین لەگەڵ ڕوودانی هەر ناخۆشیەک یان لەکاتێکدا کە خودا بە هاوڕێکەت تاقیتدەکاتەوە پێویستە لەسەرمان، کە ئارامگر بین وە بێگومان ئەو ئارامگرتنەش لەلای خودای گەورە پاداشتی خۆی هەیە.

ئەوەتا لە ئایەتی دواتردا دەفەرموێت: (أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ) واتە: ئەو کەسانە (واتە کەسانی ئارامگر) ئەو کەسانە صەلاواتی خوای گەورەیان لەسەرە وە خودا ڕەحمیان پێ دەکات وە ئەوانەش لەسەر ڕێگای ڕاستن) کەواتە لێرەوە تێدەگەین کە ئارامگرتن چەندە کارێکی گەورەیە لەگەڵ ئەوەی کە کارێکی زۆر قورسە بەڵام پێویستە لەسەرمان کە ئارامگر بین و ببینە نمونەیەکی زۆر جوانی کەسی ئارامگر بۆ کۆمەڵگەکەمان بە گشتی وە بۆ هاوڕێکانمان بە تایبەتی.



## لێبوردەیی:-

کاتێک ئێمەی مرۆڤ هەڵەدەکەین بەرامبەر بە یەکتری، ئەوە دوای ئەوەی کە درکی پێدەکەین ئەوەی کردوومانە هەڵەبووە داوای لێبوردن لە بەرامبەرەکەمان دەکەین.

بەڵام هەندێک هەڵە هەیە، کە کاتێک دەیکەیت ژیانی بەرامبەرەکەت دەگۆڕێت و ژیانی لێ ناخۆشدەبێت، وە هەندێك جار بەهۆی کردنی قسەیەکی هەڵەوە خۆشەویسترین کەسە نزیکەکانی ژیانی لێدوور دەخەیتەوە، چونکە مرۆڤ کاتێک دەیبیستێت ئەو کەسانەی، کە خۆشیدەوێن هەڵەیەکیان بەرامبەر کردووە یان هەڵەیەك لە ڕەفتار و کەسایەتی هەیە هەوڵدەدات لێی دورکەوێتەوە تا توشی کێشەی نەکات.

بەڵام گیانی لێبوردەی پێویستە لە مرۆڤدا هەبێت، چونکە کاتێك مرۆڤ هەڵەیەك دەکات و بەهۆی ئەو هەڵەیەوە ئازاری پەشیمانی دەچێژێت چیتر ئەو هەڵەیە دووبارە ناکاتەوە و ئەزمونی لێوەردەگرێت و لێوەی فێردەبێت، بۆیە کاتێك کەسێك بە نەزانی هەڵەیەکمان بەرامبەر دەکات و پەشیمانە لەوەی کردویەتی دەبێت خۆمان بێنینە شوێنی ئەو بۆ جاری یەکەم لێی ببورین و هەلێکیتری پێ ببەخشین بەڵام هەرگیز ووک جاران متمانەی پێ نەکەیت.

دان پێدانان بەوەی، کە ئەو دڵسافیەی تۆ هەڵەیە، پێویستە وەك ئاوێنە بیت چۆنن لەگەڵتا تۆش وابیت ئەوکات قەت توشی خەم و خەفەت و هەڵەیتر نابیت وە واتلێدێت، کە نەتوانی زوو متمانە بە مرۆڤەکان بکەیت، بۆیە کە دەستت برد بۆ کونی مار و نەتزانی ماری لێیە ئەوە هەڵەی تۆ نیە، بەڵام کە بۆ جاری دووەم دەستت بۆ برد و مارەکە پێوەیدایت ئەوە هەڵەی خۆتە و نەدەبوو دوبارە ئەو هەڵەیە بکەیتەوە.



## هۆگربوون:-

سروشتی مرۆڤ وایە کاتێك کەسێکی زۆر خۆشدەوێت لە ژیانی جا ئەو کەسە (هاورێ یان هاوسەر یان دایك یان باوك یان منداڵ) بێت کاتێك، کە زۆر گرینگی پێدەدات و کاتێکی زۆر بەو دەبەخشێت لە ژیانی و هەموو نهێنیەکانی خۆی لەلا باسدەکات ئەوا دەبێتە هۆی هۆگربون و پەیوەستبونی بەو کەسە.

وایلێدێت ئەگەر ڕۆژێك ئەو نەبینێت و قسەی لەگەڵ نەکات ئەوا تەواوی ڕۆژەکە بێزار دەبێت و بیری دەکات و هەمووکات بیر لەو دەکاتەوە وە کاتێك، کە نەخۆشدەکەوێت یان توشی ڕووداوێک دەبێت ئەوا ئارامی لەدەستدەدات و دڵی لای ئەو دەبێت، ئەمەش وایلێدەکات کە بۆ ئارامکردنەوەی دڵی خۆی داوای ئەوە بکات کە ببینێت و قسەی لەگەڵ بکات، هەر بۆ نمونە چیرۆکی پێغەمبەر یوسف کاتێک براکانی پێغەمبەر یوسف بڕیاری کوشتن یان دوروخستنەوەی یوسفیان لە باوکیان دا بە ئومێدی ئەوەی، کە باوکیان هۆگریان بۆ یوسف کەم بێتەوەو زیاتر خۆشەویستی بۆ ئەوان دەربڕێ.

بەڵام پێغەمبەر یعقوب هۆگریەکەی بۆ یوسف لە جاران زیاتر بوو پێغەمبەر یعقوب لە دوری یوسف دەپارایەوەو دەیوت: خودایە ڕەحم بە پیریەکەم بکە , خودایە ڕەحم بە زەلیلیەکەم بکە , خودایە ڕەحم بە تەمەنە زۆرەکەم بکە , خودایە ڕەحم بە لاوازیەکەم بکە.

خودای گەورەش وەڵامی یعقوبی دایەوەو فەرمووی: ئەی یعقوب سـوێند بە گەورەیی و دەسـەڵاتی خۆم , سـوێند بە بەرزی خۆم بەسـەر بەنـدەکانمەوە ئەگەر یوسـف مردبێ بۆت زینـدوو دەکەمەوە بەڵێ ئەوەیە هێزی خۆشەویستی و هۆگر بوون.

بەڵام کاتێك کە ئەوکەسە لەدەستدەدات ئەوا هەست بە ڕوخان دەکات چونکە بەتەواوی هۆگری خۆی کردووی وای لێدەکات قەت لەبیری نەکات هەرکاتێك باسـی ئەوی لەلا دەکەن و یاخود یادگاریەکانی ئەوی بیربێتەوە ئەوکاتانەی لەگەڵ ئەوی بەسـەر بردووە ئەوا پێی تێکدەچێ و دەیخاتە گریان.

هەر بۆیە ئێمەی مرۆڤ با دڵمان گیرۆدە و هۆگری کەس نەکەین بەڵام بـا هەموانمـان خۆشـبوێـت، چونکە خۆشـەویسـتی ناتڕوخێنێت ئەگەر هۆگربونی لەگەڵ نەبێت.



## پاراستنی ئەمانەت:-

کاتێك دوو کەس، کە دەبن بە هاورێی نزیکی یەکتر و متمانەی نێوانیان زۆر بەهێز دەبێت یەکتری زۆر باش دەناسن، ئەوە لەلایان ئاساییە، کە بەنرخترین شت یان باشترین شتیان کە هەیانە لەلای ئەوی دابنێت، وەك ئەمانەت بۆی بپارێزێت و دڵنیایە لەوەی، کە بە سەلامەتی جێیدەهێڵێت و بە سەلامەتی بەدەستی دەگاتەوە.

هەرکاتێك ئەمانەت لەلای کەسێك دادەنەیت پێویستە ڕەچاوی هەندێك شت هەیە بیکەی، وەك ئەگەری ئەوەی کە ئەمانەتەکەت لەلای ئەو ونبێت یان بدزرێت لەکاتێکدا ئەو هیچ تاوانێکی نیە.

وە لەبەر ئەوەی متمانەی تەواوی پێکردووە پێویستە باوەڕیشی پێبکات، کە هەرچی بەسەریدا هاتووە دیارە، کە خێری تێدایەو خودای گەورە لە کارەساتی گەورەتر پاراستویەتی واتە پێویستە بڕوای بە قەدەری خودا هەبێت.

پێغەمبەری خودا (د.خ) ئەوەندە دەست پاک و ئەوەندە راستگۆ بوو لەناو خەڵکدا ناسرابوو بە (صادق الامین) ئەوەندە دەست پاک بوو بە ڕادەیەک کە تەنانەت بێ باوەڕەکانیش ئەگەر ئەمانەتێکیان هەبوایە لە ماڵی پێغەمبەر (د.خ) دایاندەنا

تەنانەت ئەورۆژەی کە کۆچیشـــی کرد بۆ مەدینە علی کوری ابی تالیبی لە دوای خۆی بە جێدەهێلێت لەگەڵ خۆی نایبا تەنها بۆ ئەوەی کە ئەو ئەمانەتانەی کە لەلای ماوە سبەی علی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان.

مەبەســـت لە پاراســـتنی ئەمانەت تەنها مەبەســـتمان پارە نییە بەڵك و پاراستنی شوێنێك وەك ئەمانەت یان پاراستنی کەسێك ئەوانە بەنرخترین ئەمـانەتن بۆ ئێمەی مرۆڤەکـان، ئەمـانەت جێدەهێڵدرێت و دەبردرێت.

کاتێك شـــتێك لەکەســـێك وەردەگری بۆ ماوەیەکی کاتی ئەوا دەبێتە ئەمانەت لەلای تۆ.

وە باشترین ئەمانەت پارێز ئەوکەسەیە کە ئەمانەتەکە ڕێك وەك خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی.



## نهێنی بپاریزە:-

هەریەکە لە ئێمە کاتێك کەسێك دێتە ژیانمان دەبێت بە هاوڕێی نزیك و پێکەوە ئاسوودە دەبین و متمانەی تەواوی یەکتر بەدەستدێنن، حەز بەوە دەکەین زۆربەی کاتەکانمان بەیەکەوە بەسەر ببەین و زۆرترین یادگاری پێکەوە تۆمارکەین، هەموو نهێنی و پلان و کارەکانی خۆتی لەلا باسدەکەی ئەویش بەهەمان شێوە باسی پلان و کار و پرۆژەی خۆی لەلای تۆ دەکات.

هەریەکەتان پێویستە، وەك چۆن نهێنیەکانی خۆت دەشاریتەوەو ناتەوێ کەس پێی بزانێت و دەیپارێزیت بە هەمان شێوە دەبێت بۆ هاوڕێکەت وابیت.

ئەگەر بە هۆی هەر هۆکارێکەوە بێت ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوڕێیەتی نێوانتا پچڕا و لێکدوورکەوتنەوە، ئەوە باشترین و جوانترین ڕەفتار، کە پێویستە بیکەن پاراستنی نهێنی یەکترە، نەك دژایەتی کردنی یەکتر و بەکارهێنانی نهێنی هاوڕێکەت وەك چەکێك لە بەرامبەری.

کاتێك کە تۆ نهێنی کەسێك دەشاریتەوە و دەیپارێزی ئەوە خودای گەورەش نهێنی عەیبەکانی تۆ دەشارێتەوە، بۆ هەر کەسێك ئەگەر هاوڕێشت نەبوو ڕەفتارێکی هەڵەی کردوو تۆ دیتت وە دانیپێدانا کارەکەی هەڵەیە ئەوە تۆ نابێت لەلای هیچ

کەس باسـیبکەت بەڵك و بۆی بپۆشـەو پێی بڵێت ڕەفتارەکەت هەڵەبوو دووبـارەی مەکەوە جـارێکیتر، بەم شـێوەیە ویژدانی خۆت ئاسودە دەکەیت و خوداش لە خۆت ڕازیدەکەیت.



## خۆبە گەورە زانین:-

منەت کردن یان خۆ بەگەورە زانین بەسەر خەڵکیدا، یەکێکە لەو سیفەت و ڕەفتارانەی، کە مرۆڤ ناشیرین دەکەن لەلای دەوروبەرەکەیان.

مرۆڤی خۆبە گەورەزان هەمیشە خۆی بە جیاواز دەبینێت لە دەوروبەر و باشیەکان و خۆشیەکانی ژیان تەنها بە شایەنی خۆی دەزانێت و خۆپەرستە، وە هەمیشە ترسی ئەوەی هەیە کە خەڵکیتر واتە دەوروبەرەکەی لەو باشتربن و زیاتر چێژ لە ژیان ببینن و دڵخۆشبن.

وە پێیوایە ئەو قەت هەڵە ناکات و هەرچی ئەو بیڵێت ڕاستە، وە تەنها قسەی خۆی دەسەلمێنێت و گوێ بۆ ڕاو بۆچوونی دەوروبەرەکەی ناگرێت.

وە بە قسەیەکی ئاسایی تووڕە دەبێت و زوو هەڵدەچێت، وە لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی ناو خێزان و خزمەکانی سارد دەبێت و تێکەڵ بە کەس نابێت و دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر، وە مرۆڤی خۆبە گەورەزان مرۆڤێکی بێ قەناعەتە بە هەموو شتێکی سادە و هەرزان ڕازینابێت.

بۆیە هەرکەسێك ئەم تایبەتمەندیە خراپانەی تێدا هەبێت خەڵکی خۆیانی لێ بەدوور دەگرن و نایانەوێ هاوڕێیەتی بکەن.

ئەوکاتە دەبینێت کە بەتەنیا لە هەموو سەختیەکانی ژیان جێهێڵدراوە و هیچ ڕێگە چارەی لەبەردەست نەماوە تاکە ڕێگەی پەشیمان بوونەوەیە.

بۆیە خودای گەورە لە قورئاندا باس لەوە دەکات کە مرۆڤی خۆبەگەورەزان نەفرەتی لێکراوە چونکە سیفەتی گەورەی تەنها شایستەی خودای تاك و تەنهایە.

بۆیە هەمووکات ئێمەی مرۆڤەکان پێویستمان بەوەیە کە زوو زوو سەیرێکی ڕەفتار و سیفەت و خووەکانمان بکەینەوە تا بزانین چی هەڵەمان هەیە کە لەلای خودا و خەڵکیش پەسند نییە، تا بتوانین خۆمانی لێ بپارێزین و هەوڵبدەین نەیهێڵین لە خۆماندا، هەمیشە کە داوای شتێکمان لێدەکرێت کە بیکەین پێوستە سەرەتا بزانیت کە ئەوکارەی تۆ دەیکەیت خودا پێی خۆشە یان نا تاوەك و تۆش بە گوێرەی ئەوە بڕیار لەسەر داواکاری کار و پیشەکەت بدەیت.



## چاولێکەری:-

هەریەکە لە ئێمەی مرۆڤەکان حەزدەکەین ببین بە خاوەنی باشترینەکانی سەر ئەم دونیایە.

بەڵام مرۆڤ پێویستە بزانێت هیچ شتێك بە ئاسانی بەدەست نایە، تەنها هەوڵدان و کاریگەری خۆت لەسەر گەیشتن بەو شتە دەبن بە هۆکار تا زوو بەدەستیبهێنیت.

بۆیە هەوڵمەدە چاو لە دەوروبەرەکەت بکەیت و بڵێیت من بۆچی نیمەو ئەوان هەیانە جا مەبەست لەمەر شتێك کە نرخێکی زۆری هەبێت لە ڕووی ماددییەوە.

چاولێکەری لایەنی خراپی زۆرە کە دەبێتە هۆی نائومێدی و بێهیوای، ئەگەر توانای بەدەستهێنانی ئەوشتەمان نەبێت، وە دەبێتە هۆی دروستبونی کێشەی کۆمەڵایەتی وە زۆر جار دەبێتە هۆی تێکدانی شیرازەی خێزان و جیابونەوەی هاوسەرانی لێدەکەوێتەوە.

لەگەڵ هەبوونی زۆر لایەنی خراپ لەسەر ژیانی تاك، چاولێکەری زۆر جار سوود بە مرۆڤ دەبەخشێت لە ڕووی هەندێك لایەنی مەعنەویەوە، وەك چاولێکەری لە بەهێزکردنی پەیوەندی و عیبادەتت لەگەڵ خودا، یان چاولێکەری لە لایەنی خوێندنەوە و خۆ ڕۆشنبیر کردن، یان چاولێکەری لە خوێندن بۆ

بەدەستهێنانی نمرەی بەرز، یان چاولێکەری لە دۆزینەوەی کار و پشت بە خۆ بەستن و..... هتد.

بۆیە هەرکاتێك ویســتمان لە یەکێك لەم بوارانە خۆمان بەهێز بکەین، و بەو ئاســتە بگەین، کە دەمانەوێت ئەوە باشــترین ڕێگا چاولێکەریە.

بەڵام چاولێکەری لە بابەتێك کە لەدەســتت نێیە لایەنی خراپی زۆرە زۆرجار بەخۆت دەڵێیت من شکست خواردووم کردنی ئەم قسە نەرێنیانە مرۆڤ تووشی خەمۆکی دەکات.



## گاڵتەکردن:-

ئێمەی مرۆڤ بۆ ئەوەی یەکتری بشـــکێنین و کەســـایەتی یەکتر لەکەداربــکەیــن، هەوڵ ئەدەیــن بە گــاڵــتە کــردن بە بەهرەمەنـدییەکـان و بە گـاڵتەکردن بە لێهـاتوویی و توانـای کارکردنمان گەورەی و سـەرکەوتنەکانی یەکتری نەهێڵین لە پێش چاوی خەڵك.

تیر لە دڵی یەکتر مەگرن و توانج لە یەکتری مەدەن ئەگەر بۆ تۆ تەنهـا قســـەیەکە و بەس، ڕەنگە بۆ بەرامبەرەکەت لەت لەت بوونێکی گەورەبێـت، ڕەنگە قســـەیەکی گـاڵتە ئـامێزی تۆ وا لە کەســـێك بکات ئەو شـــەوە تا بەیانی خەوی لێنەکەوێت، وای لێبکات نانی پێنەخورێ.

دوور نییە قسـەیەکی تۆ مرۆڤێك پڕبکات لە ویستی تۆڵە کرنەوە، ڕەنگە قســەیەکی تۆ لۆچێکیتر لە ناو چاوانی کەسـێکدا زیادکا و ڕەنگە وا بکات تاڵە مووەکانی زووتر سپی ببن.

هەرگیز هەوڵ مەدە بەناوی گاڵتەکردن دڵی کەســێك وردوخـاش بکەیـت و ڕقی لە دڵـدا بچەســـپێنیت بەرامبەر بە خۆت، گاڵتە بکەن و پێبکەنن و قاقا لێدەن بەڵام بە یەکتر نا.

ئەتوانین لەجیـاتی ئەوەی گـاڵتە بکەین بە یەکتر، یەکتر پێش بخەین.

وتنی یەك وشـــە وەك «تۆ زۆر جوانیـت» بە کەسـێـك کە لە ژیـانـدایە زۆر بـاشـــترە لەو ســـتـایشـــانەی کە لە دوای مردنی دەیکەیت.

یەك وشـەی وەك « تۆ کەسـێکی زۆر باشـی» باشـترە لە هەموو ئەو شـــتـانەی کە لە دوای مردنی ئەو کەســـە خەمبـاری بۆ چاکەکانی دەردەبڕیت.

یەك گوڵ بدەیتە کەسێك کە لە ژیاندایە، باشترە لە هەموو ئەو چەپکە گوڵانەی کە لەسەر گۆڕەکەی دادەنرێن.

یەك وشـەی «تۆم خۆشـدەوێ» هەموو دونیا دێنێت بۆ کەسێك کە لە ژیاندایە، نەك لەدوای ئەوەی کە ڕۆشـتووە و لە خەیاڵتدا پێیبڵێیت.

ئەوە خۆمانین دەتوانین بە بەکارهێنانی دەستەواژە جوانەکانمان ژیان مانادارتر بکەین و لای یەکتر خۆشـەویسـتبین بەوشـێوەیە ژیان جوان و گرنگ ئەبێت بۆ هەر یەکە لە تاکەکانی کۆمەڵگە.



## ئەنجامی پۆزلێدان:-

پۆزلێـدان یەکێکە لە قێزەونترین و نـاشــرینترین ســیفەتەکانی مرۆڤ، دەبێتە هۆی کەمبونەوە و لەکەداربوونی کەسـایەتی، وە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لەپێش چاوی دەوروبەرەکەت ناشرینبیت و ڕقیان لێتبێتەوە.

چونکە پۆزلێـدان ســیفـاتی مرۆڤی خوانەنـاس و ئەقڵ نـا کامڵە هەریەکەمان ئەوەی ئەمڕۆ هەمانە ڕەنگە بۆ ســبەی لەدەســتی بدەین و خودا لێمان بسەنێتەوە.

وە ڕەنگە ئەوەی تۆ پۆزی پێوە لێدەدەی حەز و ئاواتی زۆرکەس بێت، کە هەوڵدەدات بەدەستیبهێنێت، بەڵام لە توانای منداڵیدا نیە، وەك تۆ بە ئاســانی بەدەســتیبهێنێت، بۆیە هەرکەســێك بیەوێت پۆزلێبدات و خۆی بەگەورە بزانێت لەبەر ئەوەی خاوەنی شــتێکە کە دەوروبەرەکەی نـاتوانن هەیـانبێـت ئەوا خـودا لێیدەسێنێتەوە و خێری لێنابینێت ئەگەر زووبێت یان درەنگ.

وە پێویستناکات ئەوەی هەتە ئەوەی دەیکەیت و تایبەتە بە ژیانی تـایبەتی خۆت بە خەڵکی نیشـــانبـدەیـت و بـاســیبکەیـت، هەمووکەس حەزدەکات خۆشــترین ژیانی هەبێت و ئەوەی ئاوات و ئـارەزوویەتی خودا زوو پێی ببەخشـێـت، بەڵام خودا ئێمەی مرۆڤەکـان دەخـاتە ژێرتـاقیکردنەوەکـانی خۆی و دەیهەوێـت

بزانێت، کە کامە بەندەی دوای ئەوەی کە شتێکی پێدەبەخشێت لەخۆی دەگۆڕێت و ڕۆزی ڕێو لێدەدات، وە کام بەندەی سوپاس و ستایشی خودا دەکات لەکاتێکدا خاوەنی ئەوە نیە، کە دەیەوێت هەیبێت.

بیرکردنەوەی مرۆڤی خواناس بەمشێوەیە کە دەڵێت "دیارە خودا باشتر دەزانێت لە هەبوون و نەبوونی ئەم شتە یان ئەم کەسە لە ژیانم" خوای گەورە لە قورئاندا لە سورەتی کهف باسی دوو پیاوومان بۆ دەگێڕێتەوە کەیەکێکیان سەروەتو سامانیکی زۆری هەبوو و خودا منداڵی زۆری پێ بەخشیبوو بەلام ئەوی تریان شتێکی وای پی نەبەخشیبوو هاوڕێ دەوڵەمەندەکە لە خۆبایی ببو بەم هەموو سەروەت و باغ و منداڵەبە هاوڕێ هەژارەکەی وت من سەروەت و سامانم لە تۆ زیاترە وە منداڵ و خزمەتکاریشم لە تۆ زیاترە کاتیک، کە دەچووە ناو باخەکەی دەیوت بڕوا ناکەم هەرگیز ئەو سەروەت و سامانەم لەناو بچێت وە باوەڕیش ناکەم کە قیامەت بەرپابێ ' دەیوت ئەگەر بگەڕێمەوە بۆلای خوداش ئەوا باشتر لەم باخەم پی دەبەخشێت هاوڕێ هەژارەکەی کە زۆر ئیماندار بوو پێی وت ئایا تو بێباوەڕی بەرامبەر ئەو خودایەی کە تۆی لە خۆڵ دروستکردوە پاشان هەنگاو بە هەنگاو دروستی کردی تاکو بووی بەم پیاوەی ئێستا دواتر بەهۆی لوت بەرزی ئەم پیاوەوە خوای گەورە هەموو

سامان و بەروبومەکەی لەناو برد هیچ شتیکی بۆ نەمایەوە کەواتە ئەوەیە سەرەنجامی لوت بەرزی وخۆبەگەورەزانی وە هاوڕێی باش ئەوەیە کە لەکاتی لە ڕێ لادان دەتهێنیتەوە سەر ڕێگا و ناهێڵێ گومڕا بی.



## ئیرەیی بردن:-

بەشـێك لە مرۆڤەكانی ئەم سـەردەمە بوون بە ڕەخنەگری نەزان واتە بێ ئەوەی هیچ لە كارەكە یان لە بابەتە تێبگەن دێن ڕەخنەت لێدەگرن، ئامانجی سـەرەكیان ئەوەیە، كە وەك خۆیانت لێبكەن و بتڕوخێنن، كەسـانێك ڕەخنە دەگرن، كە پسـپۆڕیان لەو كارە هەبێـت نەك هیچ بەهرەیەكیـان نەبێـت و تەنهـا لەبەر ئەوەی توانیوتە سـەركەوتووبیت و وەك تۆیان پێناكرێت و ناتوانن وەك تۆبن، هیچیان لەدەست نایە دێن ڕەخنە دەگرن.

ئیرەیی بردن یـان بەخیلی بە هـاوڕێكەت دەبێتە هۆی ئەوەی، كە تۆ لە پەیوەندی هاوڕێیەتی شـكسـت بهێنی، چونكە كاتێک تۆ بەخیلی بە ئەو دەبەی واتە دانت بە ئەوە داناوە كە ئەو توانایەی ئەو هەیەتی بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە تۆ نیتە، وە كاتێك مرۆڤ ئیرەی دەبات ئەوكاتە خۆبە گەورەزان و لەخۆبای دەبێت، كاتێك، كە هاوڕێكەی باسی دەستكەوتی سەركەوتنەكانی دەكات ئەو پێی توڕە و هەراسان دەبێت، بۆیە هەركاتێك هەستتكرد، كە دەتەوێ وەك كەسـێك بیت و ناتوانیت ئەوە هەوڵبدە لێیدوركەویتەوە، بێیت بگەڕێیت بەدوای بەهرەكانی خۆتدا، چونكە هەریەكەمان شارەزایی و بەهرەمەندیمان لە كارێك هەیە.

بۆیە هەوڵبدە بیدۆزیتەوە ئەوکات دەتوانیت پەرەی پێبدەیت و تێیدا سەرکەوتوبیت وە چیتر بەخیلی بە دەوروبەر و هاورێکانت نابەی.



## کات:-

کات بە گرینگترین پێوەر دادەنرێت بۆ بڕیاردان لەسەر داهاتوو و لەسەر کێشەکان و لەسەر مرۆڤەکان.
ئێمەی مرۆڤ کاتێك هەستدەکەین کە پشگوێ خراوین یان گرینگ نەماوین سارد دەبینەوە لە پەیوەندیەکان، کات بەشی هەموو شتێك دەکات وە ئەوانەی بۆتۆ کاتیان نییە ڕاستیەکەی ئەوەیە، کە هەستیان بۆت نییە.
هەوڵمەدە بەزۆر بچیتە دڵی کەسەوە، چونکە تەنها لە نرخی خۆت کەمدەبێتەوە.
کات بەخشین و گرنگی پێدان ئەچێتە یەك قاڵبەوە ئەویش مانای خۆشەویستیە، خودای گەورە سوێندی بەکات خواردووە کە چەندە گرنگ و بەهادارە کە نابێت بە کار و بە کەسی بێسود ببەخشرێ و بەفیڕۆ بدرێت، وە مرۆڤی ئاقڵ و ژیر هەمیشە سەرەتا کات دادەنێت بۆ کار و کەسە گرنگەکانی دەوروبەری.
کات بەخشین بەکارێك، کە سەرەتایە و یەکەمجارە تاقیدەکرێتەوە ئەزموونە، مرۆڤیش لە ئەزموونەوە زۆر شت فێردەبێت و زۆر هەڵە دەکات کە بۆ جارێکیتر دووبارەی ناکاتەوە.
وە کاتێك تازە مرۆڤێکیتر دەناسێت بەپێی کات لە خوو ڕەوشتی ئەوکەسە شارەزا دەبێت باشە و خراپەی بۆ دەردەکەوێت، کە ئایە هاوڕێیەتی کردن و مانەوەی لەگەڵ ئەو کەسە کارێکی باشە

یان لەبەرئەوەی پێکەوە ناگونجێن و خاڵی جیاوازی و شێوازی بیرکردنەوەیان جیاوازە پێویستە کۆتایی بەو پەیوەندیە بهێنن.

وە دەزانین مرۆڤ کاتی ڕابردووی هەیە، کە بەسەرچووە و تێپەڕیوە و لەوکاتەدا زۆر کاری کردووە، کە لەوانەیە لێی پەشیمان بێت و دووبارەی نەکاتەوە وە زۆر کاریش هەیە کردۆتی و لە ئێستادا شانازی پێوە دەکات بۆ نمونە لەوانەیە کارەکە داهێنان بێت یان قازانجی کار بێت یان بردنەوەی خەڵات یان یارمەتیدانی کەسێك، کە چاکە هاتۆتەوە ڕێگای.

زۆر کات ئێمەی مرۆڤەکان ئاوات بەوە دەخوازین، کە ئەگەر کات گەڕابایەوە ئەوەی پێویستبوو بیکەین دەمانکرد بۆ نمونە کەسێك کە دایکی یان کەسێکی ئازیزی لەدەستداوە دەڵێت، ئەگەر کات گەڕابایەوە زیاتر لای دەمامەوە زیاتر ڕێزم دەگرت زیاتر خۆشەویستیم پێدەبەخشی هەموو ئەم قسانە، کە دەکرێت تەنها دەبێت بە خۆزگە و داری خۆزگەش بێ بەرە.



## تەنیایی:

مرۆڤ کە هەستی ویستن بە تەنیای لەلا دروست دەبێت هەمیشە لە ئاوەدانیەکی ڕۆحی و دڵی گەورەوە جێهێڵدراوە, یان لە بیرکردنەوەی فراوان و تیژڕەو ئەو هەستە پەرەی سەندووە, کاتێك کە تەنها ویستێکە کەسانی دەوروبەر دەتوانن چاکمان بکەنەوە, بەڵام کە بوو بە خوو کە بوو بە پێویستی ناتوانیت دەستبەرداری ئەو ڕۆحیەتەبیت کە تەنها بە خەیاڵ دەتەوێت, تەنها پێویستیت بە خۆتە ئەوەی دەتەوێت بەدەستی بهێنیت تەنها بۆخۆتت دەوێت ئەوەی دەتەوێت لێت نزیك بێت تەنها دەتەوێت خۆت بیت, کاتێك بەس خۆت نیت و خەڵکانی دەوروبەر هەوڵی نزیکبونەوەت ئەدەن ئەوا بێدەنگ لەگەڵیان کات بەڕێدەکەیت کەسایەتیت دەبێتە جێگای پرسیار چونکە هیچ قسەیەك بە باش و بە خراپ لە تۆ نابیستن هیچ هەڵسوکەوت و هەڵوێستێك لە تۆ نابینن ئەوەی دەیبینن تەنها زەردەخەنەیەکی نادیارە.



## خۆزگە:-

خۆزگە دەکرا بۆ جارێکیێ بەڕاستی یەکتریمان قبوڵ بکردایە، خۆزگە دەکرا بە دڵێکی نەشکاو ئازار نەدراو چاوپۆشیمان لە هەڵەی یەکتری بکردایە، خۆزگە کۆتای بەو چاوەڕوانییە بهاتایە کە بەپەرۆش و تامەزرۆییەوە ئەتەوێت ڕۆژەکە بێت، خۆزگە مرۆڤ کردەوەکانی زیاتربووایە لە قسەکانی، خۆزگە دڵ پاکی دەستی لەسەر مرۆڤ هەڵدەگرت ئەوکاتەی کە کەسانی خراپ هەوڵی نزیکبوونەوەی ئەدەن، خۆزگە ساویلکەیمان کەمتر تووشی هەڵەی دەکردین بەرامبەر بە باشترینەکانی ژیانمان، خۆزگە ئیتر پێویست نەبایە بمانوتایە خۆزگە!!، ژیان بە هەموو ناخۆشی و خراپی ڕۆژە تاریکەکانی ڕۆژانی پڕ لە سەرکەوتن و پڕ لە دەستکەوت و ڕووناکییان لێوە بەرهەمدێت، مەڕوخێ شکست یان لەدەستدان باشتر بە مرۆڤ دەبەخشێت بۆیە بەهێزبە بەرانبەر ناخۆشی و ستەمی بەندە خراپەکان.



## ترس:-

ترس دوژمنێکی ناوەکی نێو ناخی مرۆڤەکانە ئامانجە نزیکەکانی لێ دوور دەخاتەوە, کارە ئاسانەکانی لەلا قورس دەکات , توشی شڵەژان و دڵەڕاوکێی دەکات , ئەو ترسە ناوەکییەی تێکدەری ژیانی هەریەك لە ئێمەیە لەناوی ببە بە دورکەوتنەوە لە بیرکردنەوەی قوڵ و نزیکبوونەوە لە هەوڵدانێکی پڕ هیوا , مرۆڤ کاتێك زاڵبوو بەسەر ترسدا دەگاتە ئەوپەڕی دڵخۆشی, بەڵام کاتێك ترس بەسەریدا زاڵ دەبێت ئەوا دەبێت بە هاوڕێیەکی ئامۆژگاریکەر هەڵەکانت فێردەکات تا دووبارە روونەداتەوە ترس هەستێکی خۆ نەویستانەیە کە بەهۆی پاڵە پەستۆی دەوروبەر و گریمانە خراپەکانی ناخمانەوە دروست دەبێت.



## قەدەر:

زۆرجـار ئێـمەی مـرۆڤـەکـان دەگـەینە ئەوپـەڕی نـائـومـێـدی لـە چـارەسـەربوونی کێشـە گەورەکـانمـان، لەپڕ، خودای گەورە چارەسـەرێکی گونجاو و ئاسـان دەنێرێت و ئەو موعجیزەیەمان نیشـاندەدات کە ئێمە بە شـتێکی ئەسـتەممان دەزانی، ئێمە بەوە فێرین کە پێشـبینی قەدەری خودا دەکەین، هەرزوو لەناو کێشـە ئاڵۆزەکانی ژیانمان نوقمدەبین و خۆمان بەدەسـتەوە ئەدەین ، گـەر تۆزێـك هیوا و کـەمێکیش متمـانـە لـە خۆمـانـدا بچێنین قەدەری خوداش بەو جۆرە دەبێت کە لە دڵی خۆمان دامانناوە.



# ثێرستی ناوەڕۆک

